


ناوی کتێب: ڕەوشتی باوەڕدار.

ناوی نوسەر: عمرو خالد.

ناوی وەرگێڕ: خالد محمد.

نۆرەی چاپ: چاپی دووەم .. تیراژ ٢٠٠٠ دانە.

ژمارەی سپاردن: (٤٢٤)ی ساڵی (٢٠٠٦).



٢٠٠٩

بیروت - لبنان

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت :

( انما بعثت لاتمم مكارم الاخلاق )



## پێشەکی وەرگێڕ:

بەناوی خوای گەورە:

نوسراو زۆرن کە لەبواری ڕەوشتە ئیسلامیەکاندا نوسراون، وە زۆرێکیشیانم خوێندۆتەوە و سودی تایبەتیم لێ بینیون . دواتر یەکێکی تر لەو نوسراوانەم بەرچاو کەوت کە ئەم پەرتوکەی بەردەستی بەڕێزتە ، دوای ئەوەی کە خوێندمەوە چێژێکی زۆرم لێ وەرگرت و سودی باشم لێ بینی.

هەستم کرد ئەم پەرتوکە لەوانی دیکە ناچێت و تایبەتمەندییەکی هەیە، دواتر بۆم دەرکەوت کە ئەو تایبەتمەندییە بریتییە لە شێوازی نوسینەکەی کە جیاوازی هەیە لەگەڵ نوسینەکانی تردا و زیاتر لە گفتوگۆ دەچێت ، بۆیە خوێنەر کەمەندکێش دەکات و لەگەڵ خۆیدا دەیباتە ناو باسەکانەوە و لە خوێندنەوەیدا هەست بە ماندوبون ناکەیت، هەر ئەمانەش هاندەری من بوون بۆ ئەوەی کاتێکی بۆ تایبەت بکەم و بیکەمە کوردی .

لەم چاپە نوێیەدا لەسەرداوای زۆرێك لە خوێنەرانی بەڕێز ڕاڤەی ئایەت و فەرمودەکانمان کردوە ، بۆ ئایەتەکان تەفسیری ئاسانمان بەکارهێناوە ، بۆ فەرمودەکانیش دەمەوێ زۆر سوپاسی جەنابی مامۆستا ناصح فتاح بکەم کە هاوکاری کردم هیوادارم چاپی دووەم سودمەنتربێ و بە هێندەی من ئێوەش لێی سودمەند بن و لەنزاکانتان من و برای نووسەر لەیاد نەکەن..

وەرگێڕ

# پێشەکی نووسەر

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو میهرەبان ، درووود و سڵاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەر (ﷺ).

دەستی بەرێزتان دەگرین بۆ گەشتێك بەم پەرتوکەدا لە ژێر ناونیشانی: ڕەوشتی باوەڕدار.. ئەویش لەبەر ئەوەیە ڕەوشت لە ژیانی مرۆڤی باوەڕداردا گرنگییەکی گەورەی هەیە ..

پێغەمبەریش(ﷺ)جەخت لەسەر ئەم ڕاستیە دەکاتەوەو دەفەرموێت: «انما بعثت لاتمم مكارم الاخلاق» .

**واتە: من بۆ تەواوکردن و کاملّ کردنی بەهاو ڕەوشتە بەرزەکان ڕەوانە کراوم.**

**ئەم پەرتووکە:**

ڕەوشتە ئیسلامیەکان بە شێوەیەکی ئاسان و سادە شەنوکەو دەکات لە ڕوانگەی گرنگی ڕەوشت لە بینای کەسێتی ئیسلامی ڕاستەقینەدا .

پاشان ئەو پاڵنەرانە ڕووندەکاتەوە کەوامان لێ دەکەن وابەستەی ئەم ڕەوشتانە بین ، پاشان باسکردن لە گرنگیان لە دونیاو دواڕۆژدا .

هەوڵیشم داوە کە هەریەك لە ڕەوشتەکان و شوێنەوارەکانی لەسەر تاك و کۆمەڵگە وگەورەیی پاداشتیان بە شێوازی گفتوگۆ بنوسم تاکو زیاتر خوێنەران ئاوێتەی باسەکان بن.

هەندێك جار بیریان دەدوێنم و هەندێك جاری تر دڵیان دەجوڵێنم.

وە زۆرجار هانیان دەدەم لەسەر هیممەت بەرزی و جێبەجێ کردنی کرداری بۆ ڕەوشتەکان .

هیوادارم بتوانم خوێنەری خۆشەویست بگەێنمە کەناری ئارامی وجێگەی بەختەوەری لە دونیاو دواڕۆژدا ...

بەڵکو ڕەوشتەکانی پێغەمبەر(ﷺ)پەیکەڵ بکەین لە ژیانماندا ، چونکە لەزەتی دڵ و سینەفراوانی و ئارامی دەرون تەنها بە شوێنکەوتنی ڕەوشتە بەرزەکانی خۆشەویستی خوا دەست دەکەوێت..

داواکارم لە خوای گەورە کە ئەم کارانەمان لێ قبوڵ بفەرموێت و بیکات بە توێشووی ترازووی چاکەکانمان و بۆمان ببێتە پارێزەر لە ئاگری دۆزەخ.

براتان

عمرو خالد



##  ڕەوشت

### پێشەکی و پرسیار :

**ڕافعی لە (وحی القلم)دا دەڵێت:**

گەر داوام لێ بکەن فەلسەفەی دینی ئیسلام تەنها لە دوو ووشەدا کۆ بکەمەوە ئەوا دەڵێم: (دامەزراوی ڕەوشت).

گەر لە گەورەترین فەیلەسوفی جیهانیش داوا بکەین کە چارەسەری کێشەکانی مرۆڤایەتی کورت بکاتەوە لە دوو ووشەدا لەمە زیاتر هیچ ناڵێت: (دامەزراوی ڕەوشت).

گەر سەرجەم زانایانی ئەوروپا کۆببنەوە و لێکۆڵینەوەی مەدەنیەتی ئەوروپا بکەن و هەمووی لە دوو ووشەدا کۆبکەنەوە دەڵێن:(دامەزراوی ڕەوشت).

ئێستە..

وەرن با ڕەوشت لە خۆمان و ژیانماندا بچێنین و بەپێی توانا گەشەی پێ بدەین.

بەڵام پێش سەرەتا..

پێ دەچێت پرسیارێك هەبێت..

ئەویش ئەوەیە:

بۆچی ڕەوشت ؟.

ئەو سودانەچین کە لە لێکوڵینەوەکەماندا دەربارەی ڕەوشت دەستمان دەکەوێت؟.

ئامانج لە لێکۆڵینەوەی ڕەوشت چیە ؟.



# ئامانجەكان

**پرسیار:**

ئەو ئامانجانە چین كە وامان لێ دەكات توێژینەوەمان هەبێت لەسەر ڕەوشت ؟.

**وەڵام :**

چوار ئامانج هەیە كە وامان لێ دەكات توێژینەوە بكەین لەسەر ڕەوشت.

ئەو ئامانجانەش بە پێی توانا بە درێژی ئاماژە پێ دەكەین.

مەبەستیش لێرەدا ئەوەیە كە ئێمە هەموومان یەك دەنگ بین و كۆك بین لەسەریان و لێیان تێ بگەین..

وە من لێرەوە داوا لەهەر بەڕێزێك دەكەم كە ئەم پەرتوكە دەخوێنێتەوە لە هەر جێگەیەكە با دڵیم بۆ بكاتەوە و هاوڕێم بێت.

## ئامانجی یەكەم:

### مەبەستی سەرەكی ناردنی پێغەمبەرە(ﷺ):

ئامانجی یەكەم لەو ئامانجانەی كە وامان لێ دەكات توێژینەوەی وورد بكەین لەسەر ڕەوشت ئەوەیە كە مەبەستی ناردنی پێغەمبەرە(ﷺ)..

دەبینم سەرت سوڕماوە!! سەرت نەسوڕمێ و بەلاتەوە سەیر نەبێت..

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

﴿إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق﴾. ئیمام مالیك ڕیوایەتی كردوە

**واتە: من بۆ تەواوكردن و كامڵ كردنی بەهاو ڕەوشتە بەرزەكان ڕەوانە كراوم.**

دەبینم دەڵێیت:

جا ئەمە مەعقولە..!! ئایا دەگونجێ كە مەبەستی سەرەكی ناردنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بۆ چاككردنی ڕەوشت بێت؟.

داوات لێ دەكەم جارێكی تر فەرموودەكە بخوێنیتەوە و لێی وردببیتەوە..

## پەیوەندی ئەمە بەمەوە چیە؟

من پرسیارێكت لێ دەكەم: مەبەست لە ناردنی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ چیە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ الأنبياء

**واتە : ئەی محمد ئێمە تۆمان ڕەوانە نەكردوە تەنها بۆ ئەوە نەبێت كە ببیتە ڕەحمەت و بەرەكەت بۆ هەموو جیهانەكان .**

بیر لەم ئایەتە بكەرەوە.. لەگەڵ من بیهێنە پێش چاوی خۆت.. گەر ساختەو ساختەكاری باڵ بكێشێت بەسەر كۆمەڵگەدا.. فێڵ و فێڵبازی بڵاو ببێتەوە.. ئەمانەت نەپارێزرێت.. خراپەو خراپەكاری ئاسایی بێتەوە.. ئایا ئەم كۆمەڵگایە ڕەحمەتی تیایە؟.

دیسان لەگەڵ مندا بیهێنە پێش چاوی خۆت.. خێزان ، ڕق وكینەو حەسودی سیمای بێت.. دەبێ ئیتر ڕەحمەتی لەكوێدا بێت؟.سوێند بە

## ڕەوشتی باوەڕدار

خوا پەیوەندیەکی بەهێز لە نێوان ئەم ئایەت و فەرموودەیەدا هەیە، وەبزانەکە... هیچ ڕەحمەتێك نیە بۆ جیهان تەنها لە ڕێی ڕەوشتەوە نەبێت.

## ئایا لەم بوارەدا لەگەڵ بۆچوونەکەی منداى...؟

وا گومان دەبەم ئێستا تۆ دەڵێیت:

بێگومان من لەگەڵ فەرموودەکەی پێغەمبەردام(ﷺ) کە دەفەرموێ:

﴿انما بعثت لاتمم مكارم الاخلاق﴾ .

بەڵام پەرستشەکان لە پێشترن..خۆ ناتەوێ بڵێی کە ڕەوشت گرنگترە لە نوێژ و ڕۆژوو و نزاوپاڕانەوە و زیکر و حەج ....هتد؟.

پێت دەڵێم: بەڵێ ڕەوشت گرنگترە، لەبەر ئەوەی هەموو پەرستشەکان ئامانج تیایاندا چەسپاندنی ڕەوشتە .. گەرنا تەنها چەند ڕاهێنانێکی وەرزشین و هیچی تر..!!.

تکایە.. بە شێوەیەکی ڕاست مەبەستەکەی من وەربگرە.. باسە فیقهی و عەقیدەییەکان تێکەڵاو مەکە.. ناوەڕۆکی ووتەکان تێبگە نەك ڕووکارەکانیان.

## نوێژ ڕەوشت ڕێك دەکات..

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴾ العنكبوت:

واتە:نوێژیش بەچاکی ئەنجام بدە ، چونکە بەڕاستی نوێژ بەرهەڵستی لە گوناه و تاوان و نادروستی دەکات ، بێگومان یادی خوا لە هەموو شت گەورەتر و بەنرخترە و خوا خۆی زانایە بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

پاکوبێگەردی بۆ خوا..!! کەواتە گەر کەسێك نوێژەکەی نەیگەڕێنێتەوە لە خراپەو تاوان.. نوێژەکەی تەنها ڕاهێنانێکی وەرزشیە. نوێژ دەکات، بەڵام خوڕەوشتی باش نەکردووە..

خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت:

﴿ انما اتقبل الصلاة ممن تواضع بها لعظمتي. ولم يستطل بها على خلقي. ولم يبت مصرا على معصيتي. وقطع النهار في ذكري. ورحم المسكين . وابن السبيل ورحم الارملة ورحم المصاب ﴾ . زبیدی ڕیوایەتی کردوە.

واتە: تەنها نوێژ لەوانە قبوڵ دەکەم گەردن کەچێتی تیا دەنوێنن بۆ گەورەیی و مەزنی من، ودەستدرێژی ناکەنە سەر دروستکراوەکانی من ، وە شەو ناکاتەوە بەسوربون لەسەر سەرپێچی کردنم، وە ڕۆژەکەیشی بەیادی من بەسەردەبات، سۆزو بەزەیی وبەڕەحم بێت بەرامبەر هەژاران و ڕێبواران و بێوەژنان و لێقەوماوان.

ئێستە بینیت پەیوەندی نێوان پەرستشی نوێژ و ڕەوشتی بەزەیی و گەردنکەچی..؟

بزانە:

گەر نوێژەکەت وای لێنەکردی بەڕەحم و بەسۆز بیت ئەوا بەرووبومی تەواوی نەبەخشیوە.

## هەروەها بەخشینیش..

خوای گەورە دەفەرموێت:

## ڕەوشتی باوەڕدار

﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ التوبة:

**واتە: لەهەندێ ماڵ و سامانی ئەو ئیماندارانە زەکات و خێر وەرگرە چونکە دەبێتە هۆی خاوێنکردنەوەی ماڵەکانیان و پاککردنەوەی دڵودەرونیان و دوعای داباڕینی ڕەحمەت بکە بەسەریاندا و ئەگەر مردیشن نوێژیان لەسەر بکە ، چونکە بەڕاستی دوعاو نوێژکردنی تۆ مایەی دڵنیایی و ئارامیە بۆیان ، خوایش هەمیشە بیسەر و زانایە.**

پاکوبێگەردی بۆ خوا!! مەبەست لە زەکات پاکبوونەوەیە. مانای پاك بوونەوەش پەروەردە بوونە لەسەر ڕەوشتی جوان.

بۆت دەرکەوت کە زەکات مەبەستەکەی وابەستەیە بە ڕەوشتەوە؟

ئەوەی ببەخشێت دڵی پڕ ڕەحمەت دەبێت..

**لەم مانا جوانە وردبەرەوە:**

ئایا پێشتر هیچت دەربارەی بەخشینی ڕەوشتی بیستووە؟!

بەڕاستی بەخشینێکە تامێکی تایبەتی خۆی هەیە..!!

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

﴿ تبسمك في وجه أخيك صدقة ﴾.

**واتە: خەندەو پێکەنینت بەدەم براکەتەوە خێرو چاکەیە.**

ئێمە پێویستە سەرلەنوێ خوێندنەوەمان هەبێت بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

ڕاستە بەدڵ ئەم فەرموودانەمان لەبەر کردوە، بەڵام ئایا هەست بەکرۆك و مانا شاراوەکانی دەکەین..؟

کەواتە ڕشدی مەنوێنە و بە بزەکانی سەر لێوت ببەخشە!!.

**با فەرموودەکە تەواو بکەین:**

﴿ تبسمك في وجه أخيك صدقة. وأمرك بالمعروف ونهيك عن المنكر صدقة. وارشادك الرجل في ارض الضلال لك صدقة . وافراغك من دلوك في دلو أخيك لك صدقة . واماطة الاذى عن الطريق لك صدقة. وبصرك للرجل الردئ البصر لك صدقة. وأعظم الصدقة لقمة يضعها الرجل في فم زوجته﴾.            ترمزی ریوایەتی کردوە.

**واتە: خەندەو پێکەنینت بەڕوی براکەتدا خێرو چاکەیە .فەرمان کردنت بەئەنجام دانی چاکەو یاساغ کردنی خراپە خێرو چاکەیە .ڕێنومایی کردنی کەسێکی ونبو لەزەوی سەرلێشێواویدا خێرو چاکەیە،ئاو لەدۆڵکەی خۆت بکەیتە دۆڵکەی براکەت خێرو چاکەیە، لابردنی پیسی وشتی ئازاردەر لەسەر ڕێکاکان خێرو چاکەیە، چاوساغی کردن بۆکەسی نابینا خیرو چاکەیە، وەخێرترین چاکەیش ئەو پاروە نانەیە پیاوێك دەیخاتە دەمی هاوسەرەکەیەوە .**

بەڕاستی.. مانای بەخشین ئیستە گۆڕا..

## هەروەها ڕۆژووش..

**پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت:**

﴿ اذا كان يوم صوم أحدكم فلا يرفث ولا يسخب. فان سابه أحدا او قاتله. فليقل: اني امرؤ صائم ﴾ . موسلیم و ئیبن ماجە ڕیوایەتیان کردوە.

**واتە: گەر ڕۆژی بەڕۆژوبونی یەکێك لە ئێوە بو با قسەی ناشیرین و دەنگ بەرز نەکات،حۆ ئەگەر کەسێك جوێنی پێدا یا شەڕی لەگەڵدا کرد بابڵێت : من کەسێکی ڕۆژو وانم .**

## ڕەوشتی باوەڕدار

پاکوبێگەردی بۆ خوا!! ڕۆژی بەڕۆژوو بوونت... ڕۆژێکی پڕ لەبەهاو ڕەوشتە.. ناگونجێ تیایدا قسەیەکی نەشیاو یان جنێو یان هەر شتێکی تری لەم جۆرەی تێدا بێت..

ئێستا بۆمان دەرکەوت کە چۆن ئامانج لە نوێژ و بەخشین و ڕۆژوو ڕەوشت بوو!!

ئیستە لەگەڵمدای کە ڕەوشت گرنگترە لە بەندایەتیەکان یان.....ئەگەر تا ئێستەش دوودڵی ئەوا حەج دوودڵیەکەت دەگۆڕێت بۆ دڵنیایی.

## ڕەوشت لە حەجدا دەگاتە چڵەپۆپە..

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِى ٱلْحَجِّ ﴾
البقرة:

**واتە:حەج لەچەند مانگێکی دیاریکراودایە ، جا ئەوەی کە لەو مانگەدا دەستبەکار بووە و بڕیاریدا حەج بکات ئەوە دەبێت نزیکی هاوسەری نەکەوێت و شەڕەچەپۆك و گوناه و موجادەلە و گوفتاری نادروست ئەنجام نەدات .**

حەج ڕاهێنانێکی قورسی چەسپاندن و دامەزراندنی ڕەوشتە.. تۆ لەوێ زۆر داکۆکی دەکەیت لەسەر ڕەوشتی جوان بەدەنگی بەرز قسە ناکەیت.. قسە بە کەس ناڵێیت.. ستەم لە کەس ناکەیت.. بەڵکو لەوانەیە زیادەڕۆیی بکەیت بۆئەوەی ڕەوشتت جوان بێت.. نزیکەی بیست ڕۆژ لەوێ دەمێنیتەوە بەم شێوەیە تێدەکۆشی لە پێناو ئەم خورەوشتە جوانانە..

**چیرۆکێك هەیە .. دەڵێ:**

چەند کەسێك پێشنیاریان کرد کە بۆ ئەوەی ئەو قەرەباڵغیە دروست نەبێت با هەر وولاتەی لە مانگێکی جیاوازدا حەج بکەن.. بۆ نموونە خەڵکی مصر لە ڕەجەبدا و خەڵکی شام لەشەعباندا و خەڵکی یەمەن لە شەووالدا و بەو شێوەیە، عەرەفات بەردەوام بە درێژایی ساڵ بێت.. بەلاّم خۆ وەلاّم بۆ ئەم کەسانە دیارە کەچیە..

پێویستە سالاّنە سێ ملیۆن حاجی تێکەڵ بن.. ئینجا لەناو ئەو ئاپۆڕایەدا ببینم بزانم چۆن ڕەوشتی خۆت ڕێك دەکەیت.. هەموویان لە یەك کاتدا ڕەجمی شەیتان دەکەن.. هەموویان لەسەر کێوی عەرەفەن لە یەك کاتدا.. ئیتر ئەو کاتە ڕەوشت دەگاتە چڵەپۆپە.. جا ئەی حاجی لە سەر ڕەوشتی جوان لەماوەی بیست ڕۆژدا و لە نێوان سێ ملیۆن کەس دا ڕاهێنانت کردووە.. ئایا ڕەوشتت جوان ناکەیت لەگەڵ دایك و باوکت..؟ لەگەڵ هاوسەرت؟ لەگەڵ نزیکەکانت؟ لەگەڵ دراوسێکانت؟..

وا هەست دەکەم ئێستا دڵنیایت لە قسەکانم..!! وانیە؟ گوێم لێتە دەڵێی: بە ڕاستی نوێژو زەکات و حەج هیچ سودێکیان نیە بەبێ کەوتنەوەی دەرئەنجامی ڕەوشتی..

## کامیان لە پێش ئەوی تریانەوەیە..

هەندێك کەس پێیان وایە کە گرنگترین شت لە دنیادا ئەوەیە کە فێری فیقه و قورئان لەبەرکردن و .....ببیت ، زانست یەکەم و دووەم ڕەوشت.. ئایا ئەم وتەیە ڕاستە..!؟

کامیان پێش کامیانە: زانست یان ڕەوشت؟

خوای گەورە دەفەرمووێت:

## ڕەوشتى باوەڕدار

﴿ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾ البقرة:

**واتە: پەروەردگارا بۆ ئەو خەڵکەی کە لەئایندەدا دێن پێغەمبەرێك لەخۆیان ڕەوانە بکە ، تا ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە و فێری کتێبە پیرۆزەکەی تۆ(واتە قورئان) و دانایان بکات تا دڵودەرونیان لە ژەنگ و کردەوەیان لە ڕەوشتی ناپەسەند پاك بکاتەوە .**

**ئەم ئایەتە لەسەر زمانی گەورەمان ئیبراهیم هاتووە. وە زانستی پێش پاك بوونەوە خستووە– کە پاکبوونەوە بریتیە لە پەروەردە بوون لەسەر ڕەوشتی جوان– واتە زانستی پێش ڕەوشت خستووە.. دەبینم ئێستە بەختەوەریت چونکە سەرکەوتیت..!**

**ئەم ئایەتە چوار جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە جارێکیان لەسەر زمانی حەزرەتی ئیبراهیم و سێ جاریش خوای گەورە فەرمویەتی.**

**شێوازەکانیان جیاوازن.. خوای گەورە دەفەرمووێ:**

﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾ البقرة:

**واتە: هەروەکو لەنێوانتاندا پێغەمبەرێکم لەخۆتان بۆ ڕەوانە کردوون کە ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێنێتەوە ، دڵودەرون و ڕواڵەت و ئاشکراتان خاوێن دەکاتەوە ، فێری قورئان و حیکمەت و داناییتان دەکات .**

**خوای گەورە لێرەدا پاکبوونەوەی پێش زانست خستووە.**

**لە بانگەوازەکەی گەورەمان ئیبراهیمدا زانستی پێش پاکبوونەوە خستووە کە تەنها ئایەتێکە، بەڵام کاتێك وتەکە ڕاستەوخۆ لە خوای گەورەوەیە پاك بوونەوە(ڕەوشت)ی پێش زانست خستووە لە سێ ئایەتدا، دەبینم دڵخۆشی بەم دەرئەنجامە..**

چونکە دەگەڕێیت بەدوای ڕاستەقینەدا.
ئەمەش ئامانجی یەکەم لە توێژینەوەکەمان لەسەر ڕەوشت کە بزانین ﴿ إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق ﴾.

## ئامانجی دووەم..

## چارەسەرکردنی ئەو دابڕانە دوورودرێژەی کەلەنێوان ڕەوشت وبەندایەتیەکاندا هەیە:

ئەمە ئامانجی دووەمە، یان بەمانایەکی کورت و پوخت تر:
**چارەسەرکردنی دابڕانی نێوان دین و دنیا...**
کەسێك دەبینی لەناو مزگەوتدا لەوپەڕی ڕەوشتبەرزی و جوانی دایە، بەڵام لە دەرەوەی مزگەوت جۆرێکی ترە... بە زمانی حاڵ دەبینی دەڵێت: گرنگ نیە، بەندایەتیەکان باشن و دینیش لەناو مزگەوت دایە. ژیانیش چیت تیا ئەوێت بیکە.. ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە...
ئەم جیاکردنەوەیە لە ئیسلامدا هیچ شوێنێکی نیە، ئیسلام هەمووی یەکە، هەمووی ئەوی تر تەواو دەکات، چا نەکەی لەوانە بیت بە بەندایەتیەکانیان سەر لە خەڵکی دەشێوێنن و خۆیان جوان دەنوێنن ، بەڵام دواتر بە ڕەوشتێکی زۆر دوور لە ئیسلام خەڵکی سەرسام دەکەن...!!.

## ئاگاداری ئەم دوو وێنەیە بە..!!

ئەم دووریەی نێوان ڕەوشت و بەندایەتیەکان دوو جۆر مرۆڤ بەرهەم دەهێنێت:

**جۆری یەکەم:**

خواپەرستێکی ڕەوشت ناپەسەند.

**جۆری دووەم:**

ڕەوشت جوانێکی سست لە خواپەرستدا.

کەسانێك دەبینی سورن لەسەر پاراستنی ئەمانەت.. ڕاستگۆی.. بەڵام نوێژ ناکەن!!

کەسانێکیش دەبینی سورن لەسەر بەندایەتیەکان... بەڵام خوڕەوشتاین جوان نیە!!

ئەم دوو وێنەیە زۆر شێوێنراون... دوورن لە ئیسلامەوە هەربۆیە مەبەست و ئامانج لە توێژینەوەی ڕەوشت ئەوەیە کە کەسێکی خواپەرستی ڕەوشت جوان دروست بکەین.. زۆر دەترسم کەتۆ لەم دوو وێنیە بیت..!!.

خوای گەورە باوەڕت زیادبکات و خوڕەوشتت جوان بکات ئەی خواپەرستی خوڕەوشت جوان..

## سوێند بەخوا باوەڕی نیە.. سوێند بەخوا باوەڕی نیە.. سوێند بەخوا باوەڕی نیە..

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

(.. سوێند بەخوا باوەڕی نیە.. سوێند بەخوا باوەڕی نیە.. سوێند بەخوا باوەڕی نیە..وتیان: کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی:

( ئەوەی کەدراوسێکەی لە خراپەی ئەمین نەبێت). موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

یاالله!! بیهێنە پێش چاوی خۆت.. ئەوەی جلەکانی بلاْودەکاتەوە و چۆڕاوەکەی دەتکێتە ماڵە دراوسێکەیەوە..ئەم فەرموودەیە دەیگرێتەوە.

وەبیهێنە پێش چاوی خۆت.. ئەوەی سەیارەکەی لە بەردەم گەراجی دراوسێکەیاندا دادەنێت و پاکی دەکاتەوە و جێی دەهێڵێت و دەچێتە ماڵەوە نوێژ بکات.. ئەم فەرموودەیە دەیگرێتەوە!!

دەبینم شڵەژاویت و دەڵێیت: چووە بۆ نوێژکردن! منیش دەڵێم: دەبینم بیرت چۆتەوە... ئەی نەمان ووت ئێمە نامانەوێ جیاوازی بخەینە نێوان ڕەوشت و بەندایەتیەکان؟.

کەسانێك هاتنە لای پێغەمبەری خواو وتیان:

ئەی پێغەمبەری خوا فلاْنە ئافرەت بە زۆریی نوێژو ڕۆژوو و زەکات ناسراوە، بەلاْم ئازاری دراوسێکەی دەدات! پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی:

(ئەوە لە ئاگردایە).

پاشان باسی ئافرەتێکی تریان کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە بە کەمنوێژ و ڕۆژوو و زەکات ناسرا بوو، بەلاْم ئازاری دراوسێکەی نەدەدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

( ئەوە لە بەهەشت دایە). ئیمام ئەحمەد و حاکم ڕیوایەتیان کردوە.

## ڕەوشتی باوەڕدار

ئامان نەكەی هەڵە تێبگەی..!! ئەمە بانگەواز نیە بۆ كەمكردنەوەی بەندایەتیەكان، ئێمە دەمانەوێت زۆر بە وردی تێبگەیت.. نەكەیت لایەك باش بكەیت و لاكەی تر واز لێ بهێنیت، لەبیرت بێت كە هیچ جیاییەك لەنێوان ڕەوشت و بەندایەتیەكاندا نیە.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

( خراپترین كەس لای خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا ئەوانەن كە خەڵك لێیان دوردەوكەونەوە تا لە خراپەیان پارێزراو بن ).بوخاری ڕیوایەتی كردوە.

دایك دەبینی ئامۆژگاری منداڵەكانی دەكات: نەكەن یاری بكەن و نزیك ببنەوە لە منداڵی فلانە دراوسێمان با لەزمانی پارێزراو بین..

سبحان الله! دەبینی بالاپۆشیشە! بەلام بەهای بالاپۆشی لێرەدا چیە؟ ئینسان بە ڕەوشتدا دەناسرێت، ئەگەر خوڕەوشتی جوان بێت ئەوا بەوە دەناسرێت و گەر بەپێچەوانەشەوە بوو بەو شێوەیە دەناسرێت، چەند پۆل و جۆر هەن لەوانەی خەڵك لێیان دوور دەكەوێتەوە بۆ ئەوەی لە شەڕیان پارێزراو بن..!.

﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ النور:

واتە:هەمووتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خوا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ڕزگار و سەرفراز بن .

### بیر بكەرەوە.. بەمە بەشێك لە ئیمانت لەدەستدا..!!

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت:

( باوەڕ حەفتاو ئەوەندە بەشە، بەرزترینیان(لااله الاالله) یەونزمترینیان لابردنی ئازاردەرێكە لەسەر ڕێگا ). بوخاری ڕیوایەتی كردوە.

یاالله! لابردنی ئازاردەرێك لەسەر ڕێگەی خەڵكی بەشێكە لە بەشەكانی ئیمان!! ئەی چی دەڵێیت دەربارەی ئەوانەی پاشماوەی خۆراكەكانیان دەكەنە سەر ڕێگاكە؟! دەزانی ئەوە بەشێك لە ئیمانیان لەدەس ئەدا؟!

ئەی چی دەڵێیت دەربارەی ئەوەی كە بەیانیان زوو كوڕەكەی هەڵدەستێنێ و پێی دەڵێت: بچۆ ئەو خۆڵە بكەرە(.......) لەسەر ڕێگاكە بۆ ئەوەی كەس نەتبینێ، ئەزانی ئەوە بەشێك لە ئیمانی لەدەست ئەدا؟!

ئەی چی دەڵێیت بەو شۆفێرەی كەموكوڕی سەیارەكەی چاك ناكات و بە دوكەڵەكەی خەڵكی ئازار ئەدات و زیان دەگەیەنێت بە ڕێبوارانی ئەو ڕێگایە؟ دەزانی ئەوە بەشێك لە ئیمانی لە دەست ئەدا؟!

**بەڵام ئەمەش وێنەی خوڕەوشتێكی جوان:**

بەسەیارەكەی بە ڕێگەیەكی بیابانیدا دەڕوات، لەڕێگە شتێك دەبینێ لەناوەڕستی شەقامەكەدا كەوتووە، دەوەستێ و ئەو شتە فڕێ دەداتە قەراغ شەقامەكەو پاشان دەڕوات.. پیرۆزی بێت بەڕاستی ئەوە لە نیشانەكانی باوەڕە.

## حەیا و ئیمان هاوڕێی یەكترن..

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویت:**

**( حەیا و ئیمان هاوڕێی یەكترن )**. منذری ریوایەتی كردوە.

**واتە گەر یەكێكیان كەموكورت بێت ئەوی تریش والێ دەكات، كەسێك دەبینیت كاتژمێری ئاگاداركەرەوەكەی بە دەنگێكی بەرز لە كاتێكی نەشیاودا كارپێدەكات، ئایا حەیای لە كوێدایە..؟**

## ڕەوشتی باوەڕدار

ئافرەتێك دەبینی دەڕواو بە هەموو دەنگی پێ دەكەنێت.. ئایا حەیای لە كوێدایە؟ دەگونجێ لە نوێژخوێنانیش بێت.. بەڵام ببورە:

**( حەیا و ئیمان هاوڕێی یەكترن ).**

لەبیرت بێت ئێمە بۆیە ئەمە دەڵێین تاكو چارەسەری ئەو دابڕان و جیاوازیە بكەین كە كەوتوەتە نێوان بەندایەتیەكان و ڕەوشتەوە... وە بۆ ئەوەی مەودای ئەو پەیوەندیە پتەوەی نێوان ئیمان و ڕەوشت بزانین، گەر دەتەوێت پلەی ئیمانت بزانیت سەیری ڕەوشتت بكە.

## ئەی خوڕەوشت ناشیرین... تۆ مفلیسی..

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت:

﴿ اتدرون من المفلس؟ قالوا: المفلس فينا من لادرهم له ولا متاع. قال: المفلس من امتي من يأتي يوم القيامة بصلاة وصيام و زكاة. ويأتي وقد شتم هذا وقذف هذا. وأكل مال هذا. وضرب هذا وسفك دم هذا. فيعطى هذا من حسناته فأن فنيت حسناته قبل أن يقضى ما عليه أخذ من سيأتهم فطرحت عليه ثم طرح في النار ﴾. موسلیم ڕیوایەتی كردوە.

**واتە: ئەزانن موفلیس و مایەپوچ كێیە؟ وتیان موفلیس و مایەپوچ لای ئێمە ئەو كەسەیە سەروەت وماڵی نەبێت . ئەویش فەرموی : مایەپوچ لەئوممەتی من ئەو كەسەیە لەڕۆژی قیامەتدا بە نوێژو ڕۆژوو زەكاتەوە دێت، كاتێك دێت جوێنی بەم داوەو ئەوی تری تۆمەتباركردوە و ماڵی ئەوی تری خواردوە ، لەمی داوەو خوێنی ئەوی تری ڕشتوە ، بۆیە چاكەكانی دەدرێتە ئەمەیان،گەر چاكەیشی نەما و هێشتا مافی لامابو ئەوا خراپەی ئەوان دەهێنرێتە سەر گەردنی ئەم و دواتریش فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە .**

دەترسم دوای ئەم هەموو ڕوونكردنەوەیە نەگەیشتبێتە دەرئەنجامی پێویست، بەڵام هەردەبێت بگەیتە ئەوەی كە هیچ جیاوازیەك لەنێوان

بەندایەتی و ڕەوشتدا نیە... بانگت دەکەم ئەی ئەو کەسەی لە ڕووبینای ئەم فەرموودەیەوە دەزانیت و بۆت دەرکەوتووە کە بێ مایە و دەست مایەی...

ببەخشە... مەبەستم ئەوەیە کە ڕەوشتت جوان بکەی..

## شیفای تیایە بۆ خەڵکی..

بەڵێ.. لە قورئانی پیرۆزدایە.. وە ئەم مفاجەئەیە شیفای دەرون و ئارامی بۆ دڵان دەهێنێتە بوون.. وادەزانی ئەمە یەکەم جارە ئەم ئایەتە دەخوێنیتەوە.

سوێند بەخوا من دەزانم چی دەڵێم، وەرە با بۆت ڕوون بکەمەوە:

دەبینی کاتێك خوای گەورە باس لە خەسڵەتەکانی باوەڕداران دەکات خەسڵەتی ڕەوشتین و بە دوایدا خەسڵەتی پەرستن دێت و بەوشێوەیە..

لە سورەتی (المؤمنون)دا خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَـٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَـٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَـٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَـٰنَـٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ المؤمنون:

**واتە: بەڕاستی ئەو بڕوادارانە سەرکەوتوو سەرفراز بوون ... ئەوانەش ئەوانەن کە لەنوێژەکانیاندا ملکەچ و دڵئارام و دڵ دامەزراون و دڵیان لای خوایە ... ئەوانەش کە لە گوفتاری بێسود و کرداری نابەجێ و بێهودە دوورە پەرێزن ... هەروەها ئەوانەش کە زەکاتیماڵیان دەردەکەن ... ئەوانەش کە پارێزەری داوێنی خۆیانن ... جگە لەگەڵ هاوسەران و کەنیزەکەکانیاندا نەبێت ، کە ئەوە**

## ڕەوشتی باوەڕدار

جێگەی لۆمە و سەرزەنشت نیە ... جائەوەی جگە لەو سنورە دیاریکراوە ڕێگەو ڕێبازی تر بگرێتە بەر ، ئەو جۆرە کەسانە بە یاخی و لەسنوور دەرچوو دەژمێردرێن ... هەروەها ئەوانەی چاودێری ئەمانەت و پەیمانەکانیان دەکەن ... ئەوانەش کە پابەندی نوێژەکانن و لەکاتی خۆیدا بەڕێك و پێکی ئەنجامی دەدەن و دەیپارێزن ... .

دەتبینم جارێکی تر ئایەتەکە دەخوێنیتەوە... ئایا پێشتر بەو شێوەیە خوێندوتەتەوە؟

ئێستە زانیت ئەو باوەڕدارانە کێن کە بەختەوەرن؟

ئەوانەن کە ڕەوشت و بەندایەتیان پەیکەڵ کردووە...

﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ﴾ النحل:

**واتە: هەرچی نازونیعمەتێکتان هەیە هەمووی بەهرە و بەخششی خوایە .. .**

سوپاسی خوای گەورە دەکەم لەسەر ئەم نیعمەتە..

فەرموو ئەمەش خەسڵەتەکانی (عباد الرحمن):

خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا ﴿٦٣﴾ وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا ﴿٦٤﴾ وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ ﴾ الفرقان:

**واتە: بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن کە زۆر بەهێمنی و سەلاری بەسەر زەویدا دەڕۆن ، کاتێکیش نەفامەکان بە قسەو قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن ، لەوەلآمیاندا دەڵێن : سلاو -ڕەوشتبەرزی خۆیان دەنوێنن- ... ئەوانەی کە شەوگار بۆ پەروەردگاریان بە سوژدە و وەستان و نوێژ دەبەنە سەر ... ئەوانەی**

که دەڵێن : پەروەردگارا:لەسزای ئاگری دۆزەخ بەدوورمان بکەو پەنامان بدە ، چونکە سزا و ئازاری لەکۆڵ نابێتەو و بەردەوامە ... بەڕاستی ئەو دۆزەخە شوێن و نیشتەجێیەکی زۆر ناخۆش و ناسازە ... هەروەها بەندەکانی خوای میهرەبان ئەوانەن کە :کاتێك ماڵ و سامانیان دەبەخشن و خەرجی دەکەن نەزیادەڕەوی تێدا دەکەن و بەزایەی دەدەن ، نە دەست نوقاوو ڕەزیلیشن ، بەڵکو لەو نێوانەدان ....

ئایەتەکانی تریش بەو شێوە..خۆت بیان خوێنەرەوە و لێیان ورد بەرەوە..

## ئەمەش بۆ تۆ..

**خوای گەورە لە سورەتی (الماعون)دا دەفەرمووێ:**

﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾ ﴾ الماعون **واتە: جا هاوار و واوەیلا بۆ نوێژخوێنانێك ... ئەو نوێژخوێنانەی گوێنادەن بە نوێژەکانیان و کارکردنی نیە لەسەریان و دڵی نادەنێ و لێی غافڵن .. ئەوانەی کە ڕیابازن و بەڕوکەش نوێژ دەکەن و دەیانەوێت خۆیان دەربخەن و ئیمانداران بخەڵەتێنن ... هەمیشەش هەوڵدەدەن بۆ قەدەغەکردنی هەموو چاکەو یارمەتی و کۆمەکی و هاوکاریەك ... .**

**ئایا پەیوەندیەك هەیە لە نێوان:**

﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴾ و ﴿ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴾ ؟!

**ئەوە پەیوەندی تەواوکاری نێوان ڕەوشت و بەندایەتیەکانە.**

## ئامانجی سێهەم..

## بۆ ئەوەی کرداری بین:

ئامانجی سێهەم لە توێژینەوەی ڕەوشت ئەوەیە کە زیاتر کرداری بین وە لەوانە نەبین کە قسە دەکەن و جێبەجێی ناکەن.

هەندێك کەس ئالودەی وانەکانن: شەممە لای فلان و یەکشەممە لای فلان و دووشەممە..........

وە ئەگەر لێی بپرسی چی دەکات دوای ئەوە؟ وەڵامی لا نیە،زمانی حاڵیشی دەڵێت: من تەنها مامۆستای ئامادەبوونم لە وانەکاندا!

تکایە بەو شێوەیە مەبە.. ئەمە ڕاست نیە.. ئەم وتەیە بخوێنەرەوە و پاشان باسی حاڵی خۆتم بۆ بکە:

( چەند دەتانەوێ فێربن فێربن، بەڵام پاداشت نادرێنەوە هەتا کارنەکەن بەوەی کەفێری بوون ).

[illegible] ئێستەش [illegible] بەڵام ڕاستەقینە لەوەدایە.. ئێمە برا خۆشەویستەکەم دەمانەوێ ئامۆژگاری بکەین..

بۆیە پێویستە لەسەرت لەپاش خوێندنەوەی هەرشتێك مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت و تەواوی بکەیت و بۆ ماوەی هەفتەیەك کاری لەسەر بکەیت.. ئەو وەختە سوێند بەخوا خێری زۆر دەبینیت، پاش ئەوەش لە نزا و پاڕانەوەکانت لەیادمان مەکە.

## ئامانجی چوارەم..

## تاکو نەبینە هۆکاری خراپبوونی خەڵك:

ئامانجی چوارەم و کۆتایی لە توێژینەوەکەمان دەربارەی ڕەوشت.. ئەوەیە کە نەبینە هۆکاری خراپ بوونی خەڵك.. ئەمە چۆن؟

مەبەستم پێی وێنەی شێواوە... ئەوەی کە بە بەندایەتی چاوبەست لە خەڵك دەکات و توشی فیتنەیان دەکات بە خوڕەوشتی ناشرین، ئەو وەختە خەڵکی دەڵێن " دەتانەوێ وەکو(.....) بین: نیشانەی نوێژ بەناوچەوانیەوە دیارە، بەڵام کە چووە سەر ئیشەکەی دەخەوێت و گرنگی پێ نادات.." وە زۆرێك لەو وێنە شێواوانەی تر..

توخوا... ئێمە دەمانەوێت لەم زنجیرە باسەی ڕەوشتەکان مانایەکی گەورەو گرنگ دەربهێنین ئەویش ئەوەیە کە:

ئێمە پاش خوێندنەوەیان و تێگەیشتنیان بە پشتوانی خوای گەورە جێبەجێیان بکەین، ئەو کاتەش وێنەیەك پێشکەشی کۆمەڵگە بکەین کە جیاوازی نەخاتە نێوان ڕەوشت و بەندایەتییەکانەوە.. یان نێوان دین و دنیاوە.. وێنەی باش و ئەمین و دڵسۆزو چاك و ڕاستگۆ،کە وڵاتەکەی خۆش بوێت، سوربێت لەسەر پارێزگاری لێکردنی..

دەی.. دەستت بخەرە ناو دەستم و پەیمانم پێ بدە لەسەر ئەوە، بزانە کە خوای گەورە ئێستە ئاگای لێتە..

# گەورەیی ڕەوشتی جوان

## قورسترین شت کە دەخرێتە تەرازووی

## بەندەوە لە ڕۆژی دواییدا!!

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویٚ:**

﴿ ما من شئ أثقل في ميزان العبد يوم القيامة من حسن الخلق ﴾.

ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە..

**واتە: هیچ شتێك نیە لەتەرازوی ڕۆژی قیامەت دا قورسو سەنگین تربێت لە ڕەوشتی جوان .**

**برای خۆشەویستم.. خوشکی بەڕێز.. بەسەر ئەم فەرموودەیەدا مەڕۆ.. لەسەری بوەستەو پرسیار لە خۆت بکە، کوا شەونوێژ؟ کوا ڕۆژووی ڕۆژێکی گەرم؟ کوا کەفالەتی بێ باوکێك؟ کوا کوا...**

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویٚ:**

﴿إن أثقل شيء يوضع في الميزان هو حسن الخلق﴾.

ئەبو داود و ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: قورسترین شت کە لە ترازودا دابنرێ : ڕەوشت جوانیە .**

## کام باوەڕدار باوەڕەکەی تەواو ترە؟!

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویٚ:**

﴿ أكمل المؤمنين إيمانا أحسنهم خلقا ﴾.ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: کاملترین باوەڕدار لەباوەڕەکەیدا جوانترینیانە لەڕەوشتدا .**

**هەروەها پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێ:**

﴿أحسن الناس اسلاما احسنهم خلقا﴾ .نیمامی سیوتی ڕیوایەتی کردوە

**واتە: باشترین کەس لەئیسلامەتیدا جوانترینیانە لەڕەوشتدا.**

**پاکوبێگەردی بۆ خوا !! تەواوترین باوەڕی باوەڕدار ئەوەیە کە خوڕەوشتی جوانترە..**

**وەباشترین کەسانێکی موسڵمان ئەوانەن کە خوڕەوشتیان جوانترە....**

**دەبینم دەپرسیت:**

**ئایا دەبیت بە باشترین کەس ئەگەر زانیاریشت دەربارەی دین زۆر کەم بیت ؟ بەڵی ئەگەر بەو جۆرەش بێت .**

**یاالله:**

**(قورسترین) و (چاکترین) و (تەواوترین) سوێندە بەخوا چەند ووشەیەکی کەمن بەڵام مانای گەورەیان هەیە ..**

## ئەمەش بۆ ئێوە ، ئەی ئەوانەی کە پێغەمبەرتان خۆش دەوێ...

**پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێ:**

﴿ ان أقربكم مني مجلسا يوم القيامة أحاسنكم أخلاقا ﴾

هەیسەمی ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: نزیکترین کەستان لێمەوە لەڕۆژی قیامەت دا ڕەوشت جوانەکانتانن .**

**بەڵێ..جیاوازی هەیە لە نزیکیمان لە پێغەمبەرەوە﴿ﷺ﴾ بەڵام نزیکترینمان لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەوەمانە کە خوڕەوشتمان جوانترە!!!!**

**بۆ ئەوانەی کە پێغەمبەری خۆشەویستیان خۆش دەویت:**

## ڕەوشتی باوەڕدار

جێگەکانتان جیاوازی هەیە لە بەهەشتدا ، تیاتاندایە کۆشکەکەی دورە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەیە دوورترە...

چ خەمێکی قوڵ و ناخۆشە لە بەهەشتدا لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دوربێت...

لاحول ولا قوە الا الله ..... ئەی چی بڵێین دەربارەی ئەوانەی لە ئاگردان ... خوایە بمانپارێزی .

## ئەو هۆیەی کە خەڵك زۆر پێی دەچێتە بەهەشتەوە !!

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

( ئەو هۆیەی کە خەڵك پێی دەچێتە بەهەشتەوە لە خوا ترسان و ڕەوشت جوانیە ).

پاکو بێگەردی بۆ خوا !! تەنها بالاپۆشی نیە کە گرنترین شت بێت ، وە چاوگرتن بەتەنها گرنترین شت نیە ..بەڵکو گرنترین شتێك ، کەبەهۆیەوە زۆرترین خەڵك بە خۆیانەوە دەبەنەی بەهەشتەوە :

لە خوا ترسان و ڕەوشت جوانیە.

وەپاکو بێگەردی بۆ خوا .. ئەم دوو داواکراوە هێڵی سەرەکین!!.

## کام بەندە لای خوا زۆر خۆشەویسترە؟

وەفدێك هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا کام بەندە لای خوا زۆر خۆشەویسترە؟ فەرمووی:

( ئەوەی کە ڕەوشت جوانترە). هەیسەمی ڕیوایەتی کردوە.

ئایا پاش خۆشەویستی خوا خۆشەویستیەك هەیە...؟

ئێستەو پاش ئەوەی زانیت گەر خوڕەوشتت جوان بێت دەبیتە خۆشەیسترین بەندە لای خوا.. چی دەکەیت؟.

## کێ لای پێغەمبەر (ﷺ) خۆشەویستترە ؟

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

( هەواڵتان بدەمێ بەخۆشەویسترینتان لای من ؟) ووتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی: ئەوەتان کە ڕەوشتی جوانترە ...

پاکوبێگەردی بۆخوا وەکو بڵێی ئەم ووشانە هانت ئەدا بۆ کێبەرکێی (ڕەوشت جوانترەکان).

ئایا بەشداری دەکەیت لەو پێشبڕکێیەدا؟ دیارییەکەشی بریتیە لە وەرگرتنی ئەم نازناوە (ڕەوشت جوانترەکان) ئەو کاتەش دەگەن بەم پلەیە، پلەی خۆشەویسترین کەس لای پێغەمبەری خوا!

﴿ وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ ﴾ المطففين.

**واتە: جا با لەپێناوی ئەوەدا پێشبڕکێکەران پێشبڕکێ بکەن .**

## پێغەمبەری خوا زەمانەتی ئەمەت بۆ دەکات...!!

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:**

﴿ أنا زعيم ببيت في أعلى الجنة لمن حسُن خلقه ﴾.

هەیسەمی ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: من زامنی ماڵێکم لە بەرزاییەکانی بەهەشت بۆ کەسێك کە ڕەوشتەکانی جوان بکات .**

وشەی (زعیم) بەمانای زامن کردن دێت..

## ڕەوشتی باوەڕدار

پێغەمبەری خوا زەمانەتی ماڵێکت لە بەرزایی بەهەشتدا بۆ دەکات، بەڵام بەمەرجێك تۆ خوڕەوشتت جوان بکەیت... ئاگاداربە خاوەنی ئەم وتەیە پێغەمبەری خوایە! ئایا مەرجەکەی قبوڵ دەکەیت..؟!.

## چۆن دڵی خەڵکی ڕابگرین؟

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت:

( ئێوە ناتوانن خەڵك لە خۆ بگرن بەسەروەت و سامانتان، بەڵکو دەتوانن لە خۆیان بگرن بە ڕووح سوکی و ڕەوشت جوانی ).

هەیسەمی ڕیوایەتی کردوە.

دەبێ لێکۆڵەرانی پەیوەنیە گشتیەکان لە سەرتاسەری جیهاندا ئەم وتەیەی پێغەمبەری خوا وەرگرن..(ڕوح سوکی و ڕەوشت جوانی).

## خوایە ڕێنموونیم بکە..

لە نزاکانی پێغەمبەر(ﷺ) :

﴿اللهم اهدني لأحسن الأخلاق لايهدني لأحسنها الا أنت﴾.

واتە: خوایە ڕێنومایم بکە بۆ ڕەوشتە جوانەکان ، تەنها تۆیت ڕێنومایی کار بۆڕەوشتە جوانەکان .

سبحان الله... پێغەمبەری خوا وا دەڵێ لەکاتێکدا خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێ:

﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ القلم:٤

واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێوێنەو مەزنیت.

بەڵام سەیرکە.. سەرەڕای ئەوەی کە پێغەمبەری خوایە بەڵام ئەم نزایە دەکات... چ سوربونێکە لەسەر خوڕەوشتی جوان، ڕاستە فەرموویەتی:

﴿ ان المؤمن ليدرك بحسن الخلق ورجة الصائم القائم ﴾.

هەیسەمی ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: کەسی باوەڕدار بەڕەوشتی جوانی دەگاتە پلەی کەسی بەردەوام بەڕۆژو وبەردەوام شەونوێژکار .**

## خوایە هەروەك چۆن بەجوانی دروستت کردوم ڕەوشتیشم جوان بکە..

سبحان الله!! ئەمە یەکێکە لە نزاکان... کاتێك سەیری ئاوێنە دەکەی، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ:

﴿اللهم كما حسنت خلقي نحسن خلقي﴾ . ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: خوایە گیان، وەك چۆن بەجوانی نیگارت کێشاوم ئاواش ڕەوشت وئاکارەکانم جوان بکە .**

یاالله... تۆ وەستاویت بەرامبەر ئاوێنە و سەرسامی بە جوانی خۆت.. بزانە پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بیر دەکاتەوە.. گرنگی بەچی دەدات.. لەگەڵ ئەوەشدا داوا دەکەیت خوا بەو شێوەیە ڕەوشتیشت بۆ جوان بکات.

## وریابە بەهەڵەدا چووی..!!

بەڵێ.. شتەکان تێکەڵاو بوون لێت، ئاسانەکانت لەلا قورس و قورسەکانت لەلا ئاسان بووە.. وا گومان دەبەیت کە ئەوەی قورسە بریتیە لە خوێندنەوەی قورئان و لەبەرکردنی.

## ڕەوشتی باوەڕدار

نا.. بەڕاستی بەهەڵەدا چوی..ئەوەی کە تۆ پێت وایە قورسە ئاسانە ، بەڵام ئەوەی قورسە ئەوەیە چۆن لە لایەنی ڕەوشتیەوە دامەزراو بیت... بەڵێ، قورس بریتیە لە گۆڕینی خود لە ناوخۆدا.

دەترسم ئەم تێکەڵکردنە بەدەستی ئەنقەست بێت..!! وە مەبەستی سەرەکیش تیایدا بریتی بێت لە ئاسانکاری..!!؟

چیە ئەبینم قسە ناکەیت..!! وادیارە قسەکەم تەواوە.

## پرسیارێك لەوپەڕی گرنگدا..

وابزانم ئێمە پەیوەست بووین بە ڕەوشتەوە.. ئێستەش کاتی ئەوە هاتووە کە بیر لە پرسیارێك بکەینەوە، چونکە بەڕاستی جێی بەردی گۆشەو بناغەی گرتووە لەم باسەدا پرسیارەکەش ئەمەیە:

**ئایا ڕەوشت گۆڕانکاری بەسەردا دێت ؟.**

بۆ ئاسانکاری:

ئایا دەگونجێ کەسێکی چروك و بەخیل بگۆڕێو ببێتە کەسێکی کەریم و بەخشندە؟.

ئایا دەگونێ کەسێکی تورە و عەصەبی ببێتە کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ؟.

ئایا دەکرێ ئەو کچەی کە حەیای نیە ببێتە کچێکی بەحەیا؟.

هەوڵبدە گفتوگۆ لەگەڵ خۆتدا بکەی تا بگەیتە وەڵامێکی گونجاو بۆ پرسیارە سەرکیەکە و پرسیارە بچوکەکانی تر..

دەتبینم دەڵێی پرسیارێکی زۆر ئاسانە، منیش پێت دەڵێم: تەنها مەبەست وەڵام دانەوەی زمان نییە !! تۆ باش دەزانی پرسیاری کرداریی نمرەی بەرزترە لە پرسیاری نەزەری وانیە؟.

## وەڵامێکی تێروتەواو..

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ:

﴿إنما العلم بالتعلم، وإنما الحلم بالتحلم، وإنما الصبر بالتصبر﴾.

ئیبن ماجە و هەیسەمی ڕیوایەتیان کردوە.

واتە: زانست بەفێربونە، حیلم و هێمنی بەخۆ هێمن کردنەوەیە ، ئارامگرتنیش بەخۆڕاهێنانە لەسەر ئارامگری .

بەم شێوەیە پێغەمبەر(ﷺ) بناغەیەکمان بۆ دادەنێت کە لێیەوە بۆمان دەردەکەوێت، ڕەوشت گۆڕانکاری بەسەردا دێت، ئاممان نەکەیت قەناعەت بە خۆت بکەیت کە ئاستەمە بگۆڕێیت، ئەمە قسەیەکی هەڵەیە.

بە دەیەها گەنج بە پلەی نەوەد گۆڕاون، هەیانە بە پلەی سەدوهەشتا گۆڕاون ئەمەش هەمووی بە بڕیار و هەوڵی خۆیان.

ئەی تۆ ئیستە بڕیاتدا کە بگۆڕێیت و خوڕەوشتت جوان بکەیت؟.

## نمونەیەك بۆ ڕوونکردنەوە..

نەفس وەکو لاشە وایە... لاشە لە سەرەتاوە تەواو نییە (منداڵ) پاشان بەخۆراك گەورە دەبێت و گەشە دەکات.. بەهەمان شێوەش نەفس

## ڕەوشتی باوەڕدار

لەسەرەتاوە تەواو نیە، بەڵام بە تێکۆشان و هەوڵدان لەسەر ڕەوشت پێ دەکات.

**ڕات چۆنە دەربارەی ئەم نمونەیە؟**

سبحان الله.. کاتێك لاشە نەخۆش دەکەوێت پێویستی بە دەرمانە بۆ چاك بوونەوەی، هەندێك جار دەرمانەکەی تاڵە.. نەفسیش بەهەمان شێوە هەندێك جار ڕەوشتێکی ناشیرینی تیایە پێویستی بە هەوڵدان و ئارامگرتن هەیە تا بگۆڕێت...

### با دروشمت..

وا دەزانم ئێستا تۆ ئیرادەیەکی زۆر بەهێزت هەیە.. لە ڕۆشنایی چاوت و سەرنجی ژیریتدا دەیبینم... وەمن پێم سەیرە چۆن تا ئێستا نەفست بەم شێوەیە وازی لێ هێناوە ؟.

دەی ڕای بکەینە ئێستا، دروشمەکەت بەرز بەرز بکەرەوە، با ئەمەش بێت: (من ئەتوانم گۆڕانکاری بکەم).

بەو شێوەیە.. وەك بڵێی تازە لەدایك بووی، ئەمە چ بەختەوەرییەکە..!!

ئایا تۆ لەو کەسە قەڵەوە کەمتری کە دروشمی (من دەتوانم گۆڕانکاری بکەم) بەرزدەکاتەوە و نەخشەیەکی ڕێجیم پیادە دەکات و کاتێك دەزانیت دەبێتە کەسێکی ڕەشیق و جوان؟.

## چۆن کەم وکورتیەکانی خۆت دەزانیت؟

**هەندیك کەس دەپرسن:**

**چۆن کەم و کورتیەکانی خۆم بزانم تا بیانگۆڕم؟**

به چوار شت دەتوانیت کەم وکورتیەکانت بزانیت:

١. هاورێیەکی چاك ئامۆژگاریت بکات.

٢. دوژمنەکەت، چونکە نە مەدحت دەکات و نە موجامەلە.

٣. ئامادە بوون لەوانە گشتی و زانستیەکاندا.

٤. خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەر(ﷺ)بۆ ئەوەی ڕەوشتی خۆتی پێ پێوانە بکەیت.

## لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)چاکترین نموونەی تەواو و جوان هەیە..

هەموو بەڵگەکانمان لەم زنجیرەباسەی ڕەوشتدا لە پێغەمبەری خواوە وەردەگرین لە: وتەکانی و کردەوەکانی...

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ .... ﴾. الاحزاب:٢١

واتە: بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نمونەی تەواو و ڕێکوپێك هەیە تا چاوی لێبکەن و شوێنی بکەون .

بزانە کە پێغەمبەری خۆشەوستمان تەنها کەسێکە لەسەر ڕووی زەوی کە لەژیاندا هەموو ئەو شتانەی تیایە کە تۆ پێویستیت پێیان هەیە و دەتوانیت شوێنپێی هەڵگری، ئەگەر چی ژیانی لەسەرەتای پێغەمبەرێتیەوە تاکو وەفاتی تەنها بیست و سێ ساڵە.

ئیمە دەتوانین بۆ نمونە گەورەمان عیسا لەو ڕووەوەی کە گەنجێکی پاك و تێکۆشەر و زاهید بوو بیکەینە پێشەنگی خۆمان.. بەڵام ناتوانین لەڕووی خێزانداریەوە بیکەینە پێشەنگی خۆمان چونکە ژنی نەهێناوە.

## ڕەوشتی باوەڕدار

هەروەها گەورەمان سولەیمان دەتوانین لەو ڕووەوەی کە دەسەڵاتدارێکی دەوڵەمەندی سوپاسگوزاری بەخشندە بووە بیکەینە پێشەنگ، بەڵام ئایا دەتوانین وەك پیاوێکی هەژاری بە ئارام بیکەینە پێشەنگ؟ نەخێر چونکە هەژار نەبووە.

بەڵام کێ دەوڵەمەند بوو هەژاریش بوو..؟ کێ بەهێز و لاوازیش بوو..؟ کێ دەسەڵاتدار و هاوڵاتیش بوو..؟ کێ باوك وباپیریش بوو..؟ کێ لاو و خێزانداریش بوو..؟ ئەوە پێغەمبەری خوایە(ﷺ)..

ئێمە هەموو شتێك دەربارەی دەزانین.. لە ژیانیدا هیچ تایبەتمەندیەك نیە.. ئێمە پەیوەندی بە خێزانەکانیەوە دەزانین.. تەنانەت وردترین شتی دەزانین(ﷺ)..

پێغەمبەرمان محمد(ﷺ)لەژیاندا بەشێکی تاریك و لێڵ نیە هەرگیز.. بەڵکو هەمووی کتێبێکی کراوەیە..

## ئایا پێغەمبەری خوات(ﷺ) خۆش دەوێ؟!!

هەندێك هەن بە پێی پێویست پەیوەست نین بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، بۆیە هەوڵ دەدەین خۆشەویستی خوا بچێنین لە دڵەکانماندا، بەمەش ئامانجێکی گەورە بەدی دەهێنین.. کارەکانمان لە زنجیرەباسی ڕەوشتدا زۆر بۆ ئاسان دەکات، ئایا تۆ ئامادەیت..؟!

## ئایا پێغەمبەرت(ﷺ) لەم سیانە لا خۆشەویستترە؟

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ:

﴿ لايؤمن أحدكم حتى أكون أحبَّ إليه من نفسه و ولده وماله ﴾ .

بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: کەس لەئێوە باوەڕی تەواو نیە تا منی لەخۆی و منداڵ و ماڵەکەی خۆشتر نەوێت .**

**جارێکی تر فەرموودەکە بخوێنەرەوە... ئەم سیانە نیشانی دڵت بدە.. تەواوی توانای خۆت وەگەڕبخە بۆ ئەوەی وەڵامێکی تەواوی ئەم پرسیارەت دەست بکەوێت:**

**ئایا پێغەمبەرەکەت(ﷺ) لەم سیانە لا خۆشەویسترە؟.**

## پرسیارەکەمان ماویەتی!!

**پرسیارەکەی پێشو ماویەتی بەڵام کەمێك جیاوازی هەیە..**

**ئایا پێغەمبەری خوات(ﷺ) لەم هەشتە لا خۆشەویسترە؟!!**

**خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾ التوبة: ٢٤

**واتە: ئەی محمد پێیان بڵێ: ئەگەر باوباپیرانتان و ڕۆڵەو نەوەکانتان و براکانتان و هاوسەرانتان و عەشرەت و هۆزتان و ماڵ و سامانێك کە بەدەستان هێناوە، یاخود بازرگانیەك دەترسن کە شکان و بێبازاری رووی تێبکات و خانوبەرەو کۆشك و تەلارێك کەحەز دەکەن لێتان تێك نەچێت و دڵخۆشن پێی ،لاتان خۆشەویستر و نازدارتر بێت لە خواو پێغەمبەرەکەی و جیهاد و تێکۆشان لەپێناوڕێبازی ئەو زاتەدا ، دەئەوە چاوەڕوان بن ، هەتا خوای گەورە دێت بەفەرمانەکانیەوە و تۆڵەتان لێ**

دەستێنێت ، خوای گەورەش هیدایەت و ڕێنموویی قەومی یاخی و لەسنوور دەرچوو نادات.

دەی! چۆن پێشتر ئەنجامتدا نیشانی دڵتی بدە و هەوڵی وەڵامی پرسیارەکە بدە..

بزانە هەر کەسێك فەزڵی یەکێك لەم هەشت شتە بدات بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) ئەوە لە فاسقانە...



# خۆشەویستی هاوەڵان بۆ پێغەمبەر(ﷺ)

## خۆشەویستی ئەبوبەکر بۆ پێغەمبەر(ﷺ):

ئەبوبەکر دەفەرموێ:

لە ڕێی هیجرەتدا بوین زۆر زۆرم تینو بوو، هەرچۆن بێ هەندێ شیرم پەیدا کرد، بردمە لای پێغەمبەری خواو وتم: بیخۆرەوە ئەی پێغەمبەری خوا، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) لێی خواردەوە هەتا لێی تێر بوو!!

چێژی جوانی و شیرینی ئەم خۆشەویستیە بکە، بەڕاستی ئەم خۆشەویستیە لە جۆرێکی تایبەتە..

## ئێمە لە کوێ و ئەم خۆشەویستیە لە کوێ؟!

ئەمەش بۆ تۆ:

سەرسام مەبە، ئەمە خۆشەویستیە... خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) زیاتر لە خود...

ڕۆژی فەتحی مەککە ئەبو قحافە(باوکی ئەبوبەکر) موسوڵمان بوو زۆر درەنگ موسوڵمان بوو، ئەو پیاوێکی نابینا بوو، گەورەمان ئەبوبەکر دەستی گرت و بردی بۆلای پێغەمبەری خوا(ﷺ) تاکو موسوڵمانبونی خۆی ڕابگەیێنێت و بەیعەت بدات...

## ڕەوشتی باوەڕدار

پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی:

( ئەی ئەبوبەکر دەکرا ئەم پیاوە بەتەمەنەت نەهێنایە بەڵکو ئێمە دەچوینە لای ).

ئەبوبەکر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێویستە خەڵك بێت بۆلای تۆ چونکە شایستەی ئەو ڕێزەی.. ئەبو قەحافە موسوڵمان بوو، ئەبوبەکری صدیق دەستی کرد بەگریان.. پێیان ووت: ئەمڕۆ ڕۆژی خۆشی‌یە، باوکت موسوڵمان بووەو ڕزگاری بووە لە ئاگری دۆزەخ چی وات لێ دەکات بگریت؟

دەزانی.. ئەبوبەکر ووتی چی..؟ ووتی: بۆ ئەوە دەگریم پێم خۆش بوو ئەوەی کە ئیستە بەیعەت بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەدات ئەبوتالیب بوایە نەك باوکم، چونکە ئەو کاتە پێغەمبەر(ﷺ) زیاتر لە ئێستە دڵخۆش دەبوو!!...

سبحان الله.. دڵخۆشیەکەی بە دڵخۆشی پێغەمبەر(ﷺ) گەورەتر بوو لە دڵخۆشیەکەی بە موسڵمان بوونی باوکی!!..

ئێمە لە کوێ و ئەم خۆشەویستیە لە کوێ..؟!

## خۆشەویستی عومەری کوڕی خەتاب بۆ پێغەمبەر(ﷺ):

عومەری کوڕی خەتاب خۆی دەیگێڕێتەوە و دەڵێ:

لەگەڵ پێغەمبەری خوا دەڕۆیشتین و چەند هاوەڵێکمان لەگەڵدا بوو، پێغەمبەری خوا دەستی گرتم و ڕۆیشتین، عومەر دەفەرمووێ: بینیم دەڵێم: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا خۆشەم دەوێیت!

بزانە دەستێکی پڕ لە خۆشەویستی و نەرمی چی بە دڵی مرۆڤ دەکات؟ تۆ دەتوانی وا بکەیت؟ لە ئیستەوە دەست پێبکە..

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی:

(لە کوڕەکەت زیاتر ئەی عومەر؟) ووتم بەڵێ، فەرمووی:(لە کەس وکارت زیاتر ئەی عومەر؟) ووتم: بەڵێ، فەرمووی:(لە خودی خۆت زیاتر ئەی عومەر؟). ووتم: نەخێر، (سەیری ئەو ڕاستگۆییە بکە لەگەڵ خۆی و لەگەڵ پێغەمبەریشدا) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(نا ئەی عومەر، ئیمانت تەواو نابێت هەتا منت لە خودی خۆت خۆشتر نەوێت).

عومەر دەفەرموێت: ڕۆیشتم، بیرم کردەوە پاشان چومەوە لای و ووتم: سوێن بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆم لە خودی خۆشم خۆشتر دوێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

( ئیستە ئەی عومەر، ئیستە ئەی عومەر ).بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

عبداللە کوڕی عومەر دەفەرمویّ: بە باوکمم ووت: باوکە چیت کردو گەڕایتەوە بۆ لای؟ عومەر فەرمووی: کوڕەکەم ڕۆیشتم و لە خۆمم پرسی کامیان زۆر پێویستن لە ڕۆژی دوایدا خۆم یان پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ بینیم زیاتر لە خۆم لەو ڕۆژەدا پێویستیم بە پێغەمبەری خوایە، و بیرم کەوتەوە کە من لە گومڕاییدا بووم و خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە ڕزگاری کردم.

عبداللە کوڕی عومەر ووتی: گەر هەموو شتێکت دەربارەی پێغەمبەری خوا بیر بچێتەوە، ئەو شتە چییە کە هەرگیز بیرت ناچێتەوە؟ عومەر فەرمووی: هەرشتێکم بیر بچێتەوە ئەو ڕۆژەم بیر ناچێتەوە کە چوومە

**خزمەتی و ویستم مۆڵەتی لێ بخوازم بچم بۆ (عمرە) ئەویش فەرمووی: (براکەم لە نزا و پاڕانەوە چاکەکانت لە یادمان مەکە!!).**

ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

**تەنها بە خوێندنەوە هەست بەم ووشانە ناکەیت.. ئەوانە سوێند بەخوا هەمووی هەست و شعورن، پێویستی بە دڵێکە پێغەمبەری خوای(ﷺ) خۆش بوویت بۆ ئەوەی لەم ووشانە تێبگات و وەریان بگرێ وەکو خۆی..**

## سەوبان تامەزرۆیی و خۆشەویستیت فێر دەکات..!!

**پێغەمبەری خۆشەویست بۆ ماوەی ڕۆژێك سەرتاسەر لە سەوبانی خزمەتگوزاری دور دەبێت، کاتێك گەڕایەوە سەوبان پێی فەرموو:**

**زۆر تەنیا بووم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پاشان دەستی کرد بەگریان، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی:**

**(ئەمە دەتگریەنێ ئەی سەوبان)، سەوبان فەرمووی: نا ئەی پێغەمبەری خوا ، بەڵام بیری پلەی تۆم کەوتەوە لەبەهەشتدا و بیری پلەو جێگەی خۆمم کەوتەوە، ئیتر هەستم بە تەنهایی و دوری کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو:**

**( ئەی سەوبان: مرۆڤ لەگەڵ ئەوەدا حەشر دەکرێ کە خۆشی دەوێ).**

**چەند دڵخۆشی بە خۆشەویستیت بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەی سەوبان!!**

**خوایە ئەو خۆشەویستیەمان پێ ببەخشی.**

## خۆشەویستی (سەواد) بۆ پێغەمبەر(ﷺ):

سەوادی کوڕی غوزیە لە ڕۆژی جەنگی ئوحددا لە ناوەڕاستی سوپاکەدا وەستا بوو . کەمێك قەڵەو بوو . پێغەمبەر(ﷺ)بە سوپاکەی دەوت (ڕیزبن... ڕێك بوەستن) کاتێك سەیری ڕیزەکەی کرد بینی سەواد زور نارێك وەستاوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ڕێك بەرەوە سەواد) سەواد وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵام هەر ڕێك نەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) هات وبەسیواکەکەی دای بە ورگی سەواددا . کاتی جەنگە . فەرمووی: ڕێك بوەستە سەواد، سەواد وتی: ئای پێغەمبەری خوا ئازارت دام، مادام خوا تۆی بەحەق ناردووە داوای تۆڵە دەکەم، دەبێ حەقەکەم بدەیتەوە!! پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:( حەقی خۆتە)، کراسەکەی هەڵدایەوە و فەرمووی تۆڵەی خۆت بکەرەوە!

سەواد کە پێغەمبەری خوای بەو شێوەیە بینی خێرا سکی پیرۆزی ماچ کرد!! و پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خۆت دەزانی ئەمڕۆ ڕۆژی پێکدادان و ڕووبەڕوو بوونەوەیە، حەزم کرد لە دوا ساتەکانی ژیانمدا پێستم بەرپێستت بکەوێ و بە ئاگری دۆزەخ نەسوتێ!!...

چی دەڵێی دەربارەی ئەم خۆشەویستییە؟!!

## لە کۆتایدا... شەرم ناکەی؟!!!

پێش ئەوەی دوانگە دروست بکەن پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر قەدی دارێك وتاری دەدا بۆ ئەوەی هەموو هاوەڵان ببینن... کاتێك دوانگەکە تەواو بوو پێغەمبەر(ﷺ) قەدەدارەکەی بەجێهێشت و چووە سەر دوانگە نوێیەکە... (ئەم فەرموودەیە لەو فەرموودە کەمانەیە کە هەموو

## ڕەوشتی باوەڕدار

هاوەڵان گێڕاویانەتەوە چونکە هەمویان بینیویانە و گوێیان لێ بووە).
دەڵێن:

گوێمان لە نرکەو ناڵەیەك بوو لە قەدەدارەکەوە لەتاو دورکەوتنەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)..!! بینیمان پیغەمبەری خوا لەسەر دوانگەکە دابەزی و چووەلای قەدەدارەکە و دەستی پیا دەهێناو دەیفەرموو:

**(ڕازی نابیت لێرە بتشارینەوە و لە بەهەشتدا لەگەڵمدا بیت؟).**

ئیتر قەدەدارەکە ئارامی گرت.. ئیبن ماجه ڕیوایەتی کردوە.

تۆ لەو قەدەدارە کەمتری؟!

قەدەدارێك بگری بۆ دورکەوتنەوەی پێغەمبەر(ﷺ).. قەدەدارێك قسە بکات.. قەدەدارێك هەست بەشیرینی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بکات..

ئایا تا ئێستە دورین لە خۆشەویستی پێغەمبەروە یان پڕ بەدڵمان خۆشمان دەوێت..؟

ئایا تامەزرۆی دیداری ئەو خۆشەویستەین؟

ڕاستگۆبە لە خۆشەویستیەکەتدا و بزانە کە:

**(لەگەڵ ئەوەدا حەشر دەکرێی کە خۆشت دەوێ)**



# چاکەکـــاری

## ڕەوشتێکی غەریب لە زەوی ئیسلامدا..!!

ئەم ڕەوشتە لەناو موسوڵمانانەدا ون بووە، وای لێ هاتووە زۆر غەریبە بە زەوی موسڵمانان، زۆر بەکەمی موسڵمانێك دەبینیت کە جێبەجێی بکات و پابەند بێت پێوەی، ئەوانەی کە وابەستەی ئەم ڕەوشتەن بەداخەوە دەبینی زۆربەیان موسڵمان نین، بەڵکو ڕۆژئاوا سودیان لێ وەرگرتووە و سەرکەوتوو بوون تیایدا و ئێمەش فەشەلمان هێنا...

ئەوە ڕەوشتی چاکەکاریە..

ئەمە چیە...؟

دەبینم بەقەدەری ئەوەی کە پێویستە گرنگیت بە چاکەکاری نەداوە..

دەزانی کەی هەست بە بەهای ئەم ڕەوشتە دەکەیت؟!

ئەوکاتەی کە کۆتا لاپەڕەی کتێبەکە دەخوێنیتەوە.

وەك بڵێی گوێم لێیە دەڵێیت: ئینشا الله خێرمان تیادا دەبینی..

## واتای چاکەکاری چیە؟

چاکەکاری زۆر بە سادەیی بریتیە لە: کارامەیی..

دەبینم سەرت سوڕماوە و دەڵێیت: بۆ ئایا کارامەیی ڕەوشتە؟.

بەڵێ لە ڕەوشتە چەسپاوەکانی ئیسلامە...

کارامەیی لە کاردا.. کارامەیی لە مامەڵەدا.. کارامەیی لە قسەکردندا..

هەموو ئەمانە لە ڕەوشتە ئیسلامیەکانن..

## ڕەوشتی باوەڕدار

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿إن الله يحب إذا عمل أحدكم عملا أن يتقنه﴾ .تەبەرانی ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: خوای گەورە ئەوەی پێخۆشە گەر یەکێك لە ئێوە کارێکی ئەنجامدا بە جوانی و تەواوەتی ئەنجامی بدات .**

**ناتەوێ خوا خۆشی بوێت؟ کارامەبە لە کارەکەتدا.. چاکە کاربە خوا خۆشی دەوێت..**

## ئایەت و بەڵگەکان..

**تکایە بە دڵ ئایەتەکان بخوێنەرەوە و لەگەڵیاندا بژی..**

**✪خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآيِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْيِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ النحل: ٩٠

**واتە: خوای گەورە فەرمان دەدات بەدادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بە خزمان و قەدەغە لە گوناهو تاوان و دەستدرێژی دەکات بۆ سەر ماڵ و نەفس و ناموس و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و بیربکەنەوە.**

**بیر لەسەرەتای فەرمانەکان بکەرەوە:**

**دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتی دان و بەخشندەیی بە خزمان...**

**خۆ ئەگەر زۆر وردبین بیت، ئایا دەرکت بەوە کردووە کە دەفەرموێ: (يأمُر) ؟.**

**✪خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ ال عمران: ١٣٤

**واتە: ئەوانەی رق و کینەی خۆیان دەخۆنەوە و خۆگرن ، لەخەڵکی خۆش دەبن و لێبوردەن ،خوای گەورەش چاکەکار و چاکەکارانی خۆش دەوێت .**

**✿هەروەها دەفەرموێ:**

﴿ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ الاعراف: ٥٦

**واتە: بەڕاستی ڕەحمەتی خوا نزیکە لە چاکەکاران و چاکەخوازانەوە .**

**جارێکی تر بیر لەم ئایەتە بکەرەوە.. بیر بکەرەوە.. ڕەحمەتی خوا لە کێوە نزیکە؟ لە چاکەکارانەوە..**

**✿خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ هود: ١١٥

**واتە:خۆگربەو بەئارام بە ، چونکە بێگومان خوای گەورە پاداشتی چاکەخوازان بەزایە نادات.**

**وە خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَـٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَـٰنُ ﴾ الرحمن: ٦٠

**واتە: مەگەر پاداشتی چاکە هەر چاکە نیە؟!**

**✿هەروەها دەفەرموێ:**

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴾ النحل: ١٢٨

**واتە: خوای گەورە لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە خۆیان پاراستوە لە گوناه و هەروەها ئەوانەش کە چاکەکار و چاکەخوازن .**

**سبحان الله!! چاکەکاران هەست بە لەگەڵبوونی خوا دەکەن.. چ هەستێکی گەورەیە کە شایستەی چاکەکارانە..**

**✿خوای گەورە دەفەرموێ:**

## ڕەوشتی باوەڕدار

﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ ۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾ يونس: ٢٦

**واتە: بۆ ئەوانەی چاکەیان کردوە ، پاداشتی چاکتر و بەهەشتی بەرین و زیاتریش ئامادەیە بەچەندەها قات ، روخساریشیان رەشی و تاڵی و ریسوایی و زەلیلی و ماندوێتی پێوە دیار نیە ئائەوانە نیشتەجێی بەهەشتن و بۆ هەمیشە ژیانی تیادا دەبەنە سەر .**

**ئەم زیادەیە چیە؟ ئەم زیادەیە بریتیە لە بینینی خوای گەورە..**

**ئەم ئایەتانەی پێشوو کاریگەرییەکی گەورەیان هەیە لەسەر دڵ و دەرونەکان.. لەبەر ئەوەی دڵەکان پاکن.. باوەڕدارن.. لەخواترسن.. پەیوەستن بە خوای خۆیانەوە. خۆ ئەگەر کاریگەرییان لەسەر تۆ نەبوو، ئەوا پێویستە بەخۆتدا بچیتەوە و جارێکی تر بیانخوێنیتەوە..**

## بەڕاستی.. پوختەی قسەی پێشکەش کردووە..

**پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:**

﴿ان الله كتب الأحسان على كل شيء﴾

**واتە: خوای گەورە چاکسازی لەسەر هەمو شتێك نوسیوە (بەپێویستی گێڕاوە).**

**وردبەرەوە لە ووشەکان، تۆ فەرمانت پێکراوە کە چاکەکار بیت لە هەموو شتێکدا. ئەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ نافەرموێ: (ان الله كتب.....) ئەوجا (٦٠) هێڵ بهێنە بەژێر ووشەی(كل شيء)دا.. تۆ فەرمانت پێکراوە چاکەکار بیت لەهەموو گەورە و بچوکێکدا.. هەرشتێك دێت بەبیرتا تۆ داوات لێکراوە چاکەکار بیت تیایدا..**

سبحان الله!! بەڕاستی پێغەمبەری خۆشەویستمان پوختەی باسەکەی خستۆتە ڕوو.. سوێند بەخوا ئەم چەند ووشە کەمە پێویستی بە ڕاپۆرت و نوسراوی زۆر نیە..
بەڵام دەبینم بیرت پارچە پارچەیە..!! تەنها بیر لە فەرموودەکەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بکەرەوە و واز لە بیرکردنەوە لەو (٦٠) هێڵە بهێنە ئەوە تەنها ژمارەیەکە..!!

## سبحان الله!! نموونەیەك کە هەرگیز بە بیردا نایەت..

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾لە فەرمودەکەی پێشودا فەرموی:
﴿إن الله كتب الأحسان على كل شيء . فأذا قتلتم فأحسنوا القتلة . وإذا ذبحتم فأحسنوا الذبحة...﴾ .

واتە: خوای گەورە چاکسازی لەسەر هەمو شتێك نوسیوە (بەپێویستی گێڕاوە) گەر ئاژەڵتان کوشتەوە بەجوانی وباشی بیکوژنەوە، گەر سەریشتان بڕی بەجوانی و بەچاکی سەری ببڕن .
سبحان الله!! چۆن ئەم نموونانەی هێنا لە کاتێکدا باس لە چاکەکاری دەکەین..؟ کاتێك من مریشکێك سەردەبڕم، کاتێك مەڕێك سەر دەبڕم، تەنانەت لەوەشدا دەبێت چاکەکار بم!!
سوێند بەخوا ئەمە نموونەیەکە بۆ خاوەن ژیریەکان..
ئایا دەگونجێ کەسێك لەسەربڕیندا چاکەکار بێت لە ژیاندا چاکەکار نەبێت؟.
بەڕاستی ئەمانە نموونەیەکن کە بەبیردا نایەن..

## بەتەنها نیەتی چاکەکاری بەس نیە!!

**با فەرموودەکە تەواو بکەین.. پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێ:**

«إن الله كتب الأحسان على كل شيء . فإذا قتلتم فأحسنوا القتلة ، وإذا ذبحتم فأحسنوا الذبحة ، وليحد أحدكم شفرته وليرح ذبيحته».

موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: خوای گەورە چاکسازی لەسەر هەمو شتێك نوسیوە (بەپێویستی گێڕاوە) گەر ئاژەڵتان کوشتەوە بەجوانی وباشی بیکوژنەوە، گەر سەریشتان بڕی بەجوانی و بەچاکی سەری ببڕن ، باهەر یەکێك لە ئێوە تیغەکەی ئامادەبکات و ئیسراحەت بەئاژەڵەکە بدات.**

**وەك بڵێی پێغەمبەر(ﷺ) پێت دەڵێ:**

**تەنها نیەتی چاکەکاری بەس نیە ، بەڵکو هۆکارەکانی چاکەکاریش بگرە..چۆن کارامە دەبی لە سەربڕیندا؟ بەوەی کە چەقۆکەت تیژ بکەیت تا ئەو گیانلەبەرە زوو ڕوحی دەربچێ و ئازار زۆر نەچێژێ..**

**بۆیە لەکاتی ئامۆژگاری و یاد هێنانەوەدا.. تۆ نیەتت چاکەکاریە، بەڵام ئەمە تەنها بەس نیە، بەڵکو پێویستە کاتی گونجاو و شوێنی گونجاو و ڕەنگ و ڕووناکی گونجاو هەڵبژێریت.. هۆکارەکان وەربگرە پاشان دەس پێبکە!.**

## ڕوونکردنەوەی لێلیەك!!

**لەسەرەتاوە.. پێت وانەبوو کە چاکەکاری لە ڕەوشتەکانە وە سەرت سوڕما کاتێك پێم وتیت: تۆ هەست بە بەهای ئەم ڕەوشتە ناکەی هەتا کۆتا لاپەڕەی ئەم کتێبە نەخوێنیتەوە.. ئێستە شتێك ڕۆشن بووەتەوە..**

بەلاّم ئەم ڕوونبونەوەیە چەند لێلیەکی تێدایە.. دەزانی بۆچی وادەڵێم؟ لەبەر ئەوەی ئەگەر ئێستە پێت بڵێم: هەوڵ بدە چاکەکاری جێبەجێ بکەی لە ژیانتدا، دەبینی تا ئێستەش قورسە بەلاتەوە.. لە بیرت بێت تۆ ناتوانی هیچ بەندایەتیەك ئەنجام بدەیت بەبێ یارمەتی خوای گەورە..

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ الفاتحة: ٥

**واتە: خوایە: تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەرلەتۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین .**

## هەموو شتێکی بە چاکی و ڕێکوپێکی دروست کردووە..

سەیرکە بزانە چۆن خوای گەورە هەموو شتێکی بەچاکی و ڕێکوپێکی دروست کردووە و لەم ئایەتە ورد بەرەوە: خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴾ السجدة: ٧

**واتە: ئەو خوایە زاتێکە هەموو شتێکی بەچاکی و ڕێکوپێکی بەدیهێناوە .**

هیچ کەموکوڕیەك لە دروستکراوەکانی خوای گەورەدا نیە..

خوای گەورە لەوەسفی ئاسماندا دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴾ الحجر: ١٦

**واتە: سوێند بەخوا ئێمە لەئاسماندا چەند خولگەیەکی گەورەمان بەدیهێناوە بۆ ئەستێرەکان و ڕازاندومانەتەوە بۆ ئەوانەی کە بەوردی تەماشای دەکەن.**

لەوەش زیاتر خوای گەورە دووپاتی دەکاتەوە و دەفەرمووێ:

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ ۖ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴾ الملك: ٣ - ٤

**واتە: ئەوزاتە ئاسمانەکانی بە حەوت چین دروست کردوە،لەنێو بەدیهێنراوەکانی**

## ڕەوشتی باوەڕدار

ئەو خوای میهرەبانەدا هیچ ناڕێکی و ناتەواویەك بەدیناکەیت ، ئەی ئینسان هەر چاو بگێڕەو سەرنج بدە بزانە هیچ درز و کەموکوڕیەك بەدی دەکەیت؟ ... پاشان هەر سەرنج بدە و چاو بگێڕەو وورد بەرەوە جارلەدوای جار کۆڵمەدە ، سەرسام و ملکەچ دەبیت ، چاوت بەنائومێدی دەگەڕێتەوە لەکاتێکدا کە چاوت ماندوە و پەکی کەوتوە .

خوا جوانە و جوانیشی خۆش دەوێ.. پاك و بێگەردی بۆ دروستکاری گەورە.. پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەموو شتێکی بە چاکی و ڕێکوپێکی دروست کردووە..

## سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان..

بیربکەرەوە ئەگەر ئاسمان تەنها دوو ڕەنگی ڕەش و سپی بوایە..

خوا دەتوانێ یان نا؟ بەڵێ دەتوانێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ البقرة: ٢٠

**واتە: بەڕاستی خوا باڵادەستی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .**

بەڵام سەیری چاکەکاری خوای گەورە بکە، سەیری چەندێتی ڕەنگەکانی ئاسمان و پلەکانی بکە، چەند ڕەنگێکی هێمن کەرەوە و جوانن..

گوێم لێتە زمانت بە الله أكبر و سوپاس و ستایشی خوای گەورەوە خەریکە..

لەمەو دوا بەهونەرەوە بڕوانە بۆ ئاسمان.. سوێند بەخوا تابلۆیەکی زۆر جوانە.. ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە چاکەکار بیت هەروەك چۆن خوای گەورە چاکەی لەگەڵدا کردوویت؟!!

﴿ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ﴾ غافر: ٦٤

**واته: روخسار و شێوازتانی نەخشاندوە ، بەجوانترین شێوەش نەخشاندویەتی .**

**ئێستە سەرەی تۆیە... خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴾ التين: ٤

**واته: بەڕاستی ئێمە ئینسانمان لەجوانترین شێوە و ڕێکوپێکترین شێوازدا دروست کردوە لەهەموو رویەکەوە.**

**سەیری شوێنی چاوەکانت بکە، شوێنی زمانت، شوێنی لوت، پاشان بڵێ: (سوپاس بۆ ئەو خوایەی بە چاکی و جوانی دروستی کردووین).. بیربکەرەوە گەر لە جێگەی دووچاوت، دوو لوت بوایە و لە جێگەی لوتیش چاوێك بوایە، بیهێنە پێش چاوت گەر گوێچکەکانمان لە ناوەڕاستی سەرماندا بوایە!**

**یاالله!! خوایە سوپاس و ستایش بۆ تۆ بە شێوەیەك کە شایەنی شکۆمەندی و گەورەییتە.**

﴿ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ﴾.

**سوپاس بۆ خوا لەسەر ئەم دروست کردنە پڕ چاکەکاری و جوانیە، گەروا نەبوایە شێوەت...........!!.**

## کەواتە با دروشممان..

**پێویستە لەسەرت لەهەموو شتەکانی ژیانتدا چاکەکار بیت و دروشمت** ﴿ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ﴾ القصص: ٧٧ **بێت.**

**واته: چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە هەروەك خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت.**

**خوای گەورە دەفەرمووێ:**

# ڕەوشتی باوەڕدار

﴿ اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴾
الزمر: ٢٣

**واتە: خوا جوانترین و پیرۆزترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە کە ئەم قورئانەیە بابەتەکانی لەیەکتر دەچن ، هەندێك باسیشی بەشێوازی جیاواز تیایدا دووبارە بۆتەوە ، جا کارکردنی ئەم قورئانە ئەوەیە کە:تەزوو دەهێنێت بەگیان و پێستی ئەو کەسانەدا کە ترسی پەروەردگاریان لەدڵودەروندا هەیە ، پاشان گیان و پێست و دڵیان نەرم و ئامادە و چالاك دەبێت بۆ یادی خواو خواپەرستی ئائەوە هیدایەت و ڕێنمونی خوایە کەهەرکەس شایستە بێت هیدایەت و ڕێنموییی دەکات بۆ ئەو پلەو پایە بەرزانە ، ئەوەش کە ڕێبازی خوا وون بکات کەس نیە ڕێنموییی بکات .**

**سوێند بە خوا مانایەکی گەورەیە، ئەوەی کە بۆ ئێمە دابەزیوە چاکترینی ئەو کتێبانەیە کە دابەزیوە.**

**ئایا شەرم لە خوا ناکەیت..؟**

**بەچاکی بونەوەری دروست کردوە.. بەچاکی تۆی دروست کردوە.. چاکترینی کتێبی بۆ دابەزاندوی.. لەگەڵ ئەوەشدا.. تۆ چاك نابیت..!؟**

**دەڵێیت: ئینشاالله چاك دەبم؟**

**مەبەستم تۆ نیە خۆشەویستم مەبەستم خراپەکارانە!!.**

# وێنەکانی چاکەکاری

## چاکەکاری لە بەندایەتیدا..

گوێم لێتە دەڵێی: جا چاکەکاری پەیوەندی بە بەندایەتیەوە چیە؟ منیش پێت دەڵێم: نوێژ بۆ نموونە بەندایەتیە، بەڵام نوێژەکەت بە چاکی ئەنجام بدەیت و کارامە بیت تیایدا، ئەمە ڕەوشتە، ئەنجامدانی نوێژ بە چاکترین شێوە، ئەمە چاکەکاریە. ڕەوشت پەیوەنیەکی پتەوی بە بەندایەتیەکانەوە هەیە..

**ئێستە چۆن چاکی و کارامەیی لە بەندایەتیەکاندا بکەم؟**

لە فەرموودە بەناوبانگەکەدا، کاتێك جبریل(سەلامی خوای لێ بێت) دێتە لای پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێ دەکات تا دینەکەمان فێربکات..

کاتێك پرسیاری چاکەکاری کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:

﴿أن تعبد الله كأنك تراه، فإن لم تكن تراه فإنه يراك﴾. بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: خوای گەورە بپەرستە وەك ئەوەی دەیبینی، خۆئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەوا خوای گەرە تۆ دەبینێ .**

**ئایا دەتوانیت لەکاتی نوێژدا وابیت؟ هەست بکەیت کە خوا دەتبینێ؟ دەبێ ئەو نوێژە چۆن بێت؟**

**بێگومان بەجوانی و چاکی ئەنجامی دەدەیت..**

**بیرۆکەیەکی زۆر جوانە.. وەرن با ڕێککەوین لەسەری:**

**کە بۆماوەی ڕۆژێك بەو شێوەیە خوا بپەرستین.. خوا بپەرستین وەك ئەوەی کە دەیبینین، خۆ ئەگەر ئێمە نەیبینین ئەوا ئەو زاتە ئێمە**

دەبینێت... هەست بە چاودێریەکی گەورەی خوایی بکەیت لە سەرت لە هەموو هەنگاوێکدا، لە بەندایەتی و هەموو شتەکانی تردا.

## خوا گوێی لێمە.. خوا دەمبینێ.. خوا ئاگادارمە..

بەسەربردنی ڕۆژێکی تەمەنت بە بەندایەتی و بە چاکی و کارامەیی‌یەوە دەتکاتە مرۆڤێکی تر.. چەند ڕۆژمان بەهەدەر داوە.. کەواتە وەرن با ڕۆژێك بەو شێوەیە بەسەر بەرین کە خوا لێی ڕازییە و پێی ڕازییە.. دەبینم ئێستە سنگت کراوەیە بۆ ڕەوشتی چاکەکاری.. سوپاسی خوا بکە.

## چاکەکاری لەگەڵ دایك وباوکدا..

**خوای گەورە دەفەرووێ:**

﴿ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴾الإسراء: ٢٣

**واتە: چاکەکار بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا.**

**پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و ووتی:**

ئەی پێغەمبەری خوا، بەیعەتت پێ‌دەدەم لەسەر کۆچکردن و جیهاد و تێکۆشان... پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

(ئایاهیچ کام لە دایك وباوکت لە ژیاندا ماون؟) پیاوەکە ووتی: بەڵێ هەردووکیان ماون، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی:

(دەتەوێ پاداشت و چاکەت دەست کەوێ؟) ووتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

(بگەڕێوە بۆ لای دایك و باوکت و چاك بە لەگەڵیاندا).موسلیم ڕیوایەتی کردوە

وادەزانی بۆ یەکەمجارە ئەم باسە دەخوێنیتەوە... بە تاێبەت (چاك بە لەگەڵیاندا و چاکەکار بە) تۆ خوێندوتەتەوە و گرنگیت پێنەداوە کە: چاکەکار بیت لەگەڵ دایك و باوکتداو بەمەش پاداشتی کۆچ و جیهاد بۆخۆت مسۆگر بکەیت!.

ئێستە دەست پێبکە!!

دەتەوێ پرسیارێك بکەیت؟ وانیە؟ دەڵێیت: چۆن چاکەکاربم لەگەڵ دایك و باوکمدا؟ منیش پێت دەڵێم: خوای گەورە دەفەرمووی: ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا﴾..

زیاتر سەرت سوڕما.. وانیە؟ تەنها دوو ووشەو بەس!! بەڵێ.. وەك بڵێی ئەم دوو ووشەیە پێت دەڵێن:

ئادەی زیرەکی خۆتمان نیشان بدە لە چاکەکاری لەگەڵ دایك و باوکتدا.. دەست پێبکە.. هەوڵ بدە.. داهێنان بکە.. هونەر بەکاربهێنە لە چاکەکارییەکەتدا بەرامبەریان:

لە سەیرکردنی چاوانت: (نەکەی بە چاوێکی تیژەوە سەیریان بکەیت)..

لە کاتی قسەکردندا: ( نەکەی دەنگت بەرز بکەیتەوە ، ئاممان گاڵتەیان پێنەکەیت).. لە کاتی پێکەنیندا..

یاالله.. ڕەوشتێکی سەیرە.. ڕەوشتێك کۆتایی نیە.. هەتا ئەم ڕەوشتە زیاد بکات نزیکتر دەبیتەوە لە خواوە..

وا هەست دەکەم ئێستە هەوڵ ئەدەیت چاکەکار بیت لەگەڵ دایك و باوکتدا داهێنانی هونەری جوان دابهێنیت.. وانیە؟

## ڕەوشتی باوەڕدار

(من متمانەم پێت هەیە) .. وەك دەست ماچکردن .. خۆشەویستی ڕاست.. وە باسکردنی بیروبۆچوونی خۆت بەو پەڕی ئەدەب و زمان شیرینی و بزەو خەندە..

بەڵێ.. ئارامی و حەوانەوەی خۆت لە چاکەکاریدا وەربگرە..

## چاکەکردن لەگەڵ کچاندا..

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێ:

﴿ما من رجل تدرك له بنتان أو أوختان، نيحسن إليهما ما صحبتاه أو صحبهما إلا أوخلتاه الجنة﴾.ئیبن ماجە ڕیوایەتی کردوە.

واتە: هەر پیاوێك سەپەرشتی دوکچ یاخود دوخوشکی کەوتەلا، بەجوانی وچاکی هاوەڵیان بو ئەوا بەهۆیانەوە دەچێتە بەهەشتەوە.

لەوانەیە ئێستە یەکێکتان بڵێ: خۆزگە کچ یان خوشکم هەبوایە، بەڵام... دە داوا لە خوا بکە کە وەچەت پێببەخشێ و تیایاندا کچ بێت.. بەڵام نەکەی دوایی بیرو بۆچوونی خۆت بگۆڕی..!!

ئایا سەرنجی ئەم ووشەیەت دا لەگەڵمدا: ﴿ نيحسن إليهما ﴾

چۆن چاکەکاربین لەگەڵ کچاندا؟

با لە پێغەمبەریخواوە(ﷺ)فێرببین و بزانین چۆن چاکەکار بووە لەگەڵ فاتیمەدا (ڕەزای خوای لێ بێت) هەچ کاتێك فاتیمە چووەتە لای پێغەمبەر(ﷺ) هەستاوە لەبەری و سەری ماچ کردووە!.

چەند لە باوکان ئەم کارە دەکەن لەئەمڕۆدا!!

بەڕاستی زۆر لە وەڵامەکەی دەترسم.

کاتێك فاتیمە شوی کرد بە علی کوڕی ئەبوتالیب و چووە ماڵی خۆیەوە.. ماڵەکەیان دور بوو لەماڵەکەی پێغەمبەر(ﷺ)... بۆیە حەزرەت چووە لای یەکێك لە هاوەڵان کە ماڵێکی هەبوو لە نزیك مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ)و پێی فەرموو:
(من بەرگەی دوری فاتیمە ناگرم دەتوانی ماڵەکەتم پێ بفرۆشی؟)
هاوەڵەکە وتی: من و ماڵەکەم لە پێناوی خوادایین ئەی پێغەمبەری خوا..
یاالله..!! چ نەرمیەکە.. چ چاکەکاریەکە بۆ کچەکەی..
(بەرگەی دوری فاتیمە ناگرم)!
تکایە شوێن پێی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵگرە، داوا بکە لە خوا کە یارمەتیت بدات بۆ ئەوەی بتوانیت ئەم کارە بکەیت.. چاك بن لەگەڵ کچەکان و خوشکەکانتاندا..
چاکەکاری لەگەڵ کچاندا لەم سەردەمەدا چۆن دەبێت..؟!
گەورەترین چاکەکاری کە لەم سەردەمەدا بتوانی بەرامبەر کچ و خوشکت ئەنجامی بدەیت ئەوەیە کە: هاوڕێیەتیان بکەیت.. گوێیان لێ بگریت.. متمانەیان پێت هەبێت.. سوێند بەخوا ئەمە ئامۆژگاریەکی بەبەهایە بۆ ئەوانەی هەست بە قورسی ئەم سەردەمە ناکەن.. چەند کچ هەیە گاڵتەی پێدەکرێ بەناوی هاوڕێیەتی و خۆشەویستیەوە؟
.تۆی دڵسۆز هاوڕێیەتی بکەو گوێی بۆ بگرە...
ئێستە دەست پێبکەو چاکەکار بە لەگەڵ کچ و خوشکەکەت..
هاوڕێیەتیان بکە...

## چاکەکاری لە سڵاوکردندا..

هەروەها لە وێنەکانی چاکەکاری.. چاکەکاریە لە سڵاوکردندا..

خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ﴾النساء: ٨٦

واتە: هەرکاتێك سڵاوو چاکوچۆنیەکتان لەگەڵدا کرا ئەوە بەجوانتر لە سڵاوەکەی ئەو یاخود هەر هیچ نەبێت وەکو خۆی وەڵام بدەنەوە .

یاالله!! تەنانەت لە سڵاوکردنیشدا من داوام لێ کراوە کە چاکەکار بم.. بیر بکەرەوە!! بەلاتەوە سەیر نەبێت.. وە بزانە کە ئەم ڕەوشتە بە پانتایی ژیانماندا بڵاو بوەتەوە...

## چاکەکاری لە گفتوگۆدا..

چاکەکاری ئەگەر گفتوگۆکە ووشەی قورسیشی تێدا بوو.. چاکەکاری لەکاتی جیاوازی بیروڕاکاندا..

خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴾النحل: ١٢٥

واتە: بە جوانترین شێوە گفتوگۆ و موجادەلەیان لەگەڵدا بکە.

بەلاتەوە سەیرە؟ وا گومانت برد کە من زیادەڕەوی دەکەم.. ئایا دەگونجێت لەکاتی قسەی قورسدا چاکەکار بیت؟ ئایەتەکە گومانەکەی گۆڕیت، وانیە؟

بەڵام چۆن چاکەکار بین؟

بۆ نموونە:

کەسێك بۆچونێك دەڵێت تۆ بەدڵت نیە.. بۆیە پێی دەڵێیت: ئەم قسە پوچ و بێمانایە چیە! خۆ ئەگەر زۆر بە ئەدەبەوە وەڵامی بدەیتەوە دەڵێیت: من بۆچونەکەتم بەدڵ نیە.. بەڵام ئەی چاکەکاری لە کوێدایە؟! چۆنە لەبری ئەم قسانەی سەرەوە بڵێیت: (دەکرێ بەڕێزت گوێ لە ڕاکەی من بگریت).
پێت چۆنە؟ زۆر جیاوازە وانیە؟

## تەواو بویت ئەی ئەبو وەلید؟!

وەرن با لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەدەبی گفتوگۆ فێر ببین..
موسڵمانان لەو ماوە قورسەدا ژیانیان دەبردەسەر کە لە مەککەدا ڕووبەڕوویان بوەوە... عوتبەی کوڕی ڕەبیعە هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتەیەکی نەشیاوی ووت.. داوای لێکرد کە واز لەبانگەوازەکەی بهێنێت و لە بەرامبەر ئەوە پارەی دەوێت یان ئافرەت یان سەرۆکایەتی بیدەنێ، یاخود گەر شتێکی لێهاتووە پزیشکی بۆ بهێنن.. لەگەڵ ئەوەشدا بزانە پێغەمبەر(ﷺ) چۆن گفتوگۆی لەگەڵدا دەکات!
فەرمووی:( بڵێ ئەی ئەبو وەلید گوێم گرتووە )، کاتێك تەواو بوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:( تەواو بویت ئەی ئەبو وەلید؟ ).
هندی ڕیوایەتی کردوە.
ئەی ئەوانەی کەلەم سەدەیەدا دەتانەوێ فێری ئەدەبی گفتوگۆ بن... لە پێغەمبەری خواوە فێر بن، لە ووتەکانی عوتبەدا سوکایەتی هەیە... بەڵام سەیری پێغەمبەر بکە(ﷺ):(بڵێ ئەی ئەبو وەلید گوێم گرتووە) فێر بن لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)...

## ڕەوشتی باوەڕدار

خۆشەویستان.. هەندێك جار دەبینین كەسی دیندار ناتوانێت گفتگۆ بكات و بە دوو ووشە ئارامیان لە دەست دەدەن.. تكاتان لێ دەكەم.. لە پێغەمبەری خواوە فێر ببنن چاكەكاربن تەنانەت لە گفتوگۆ و موجادەلەشدا..

## چاكەكاری لە قسەكردندا..

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾الاسراء: ٥٣

واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەبەندەكانم بڵێ : چاكترین گوفتار بڵێن.

جوانترین و خۆشەویسترین و نەرمترین ووشە هەڵبژێری..

وا هەست دەكەم تۆ ئێستە ڕوح سوك و هیممەت بەرزی!! زۆر بە ئاسانی كارلێك لەگەڵ ئایەتەكاندا دەكەیت.. تۆ كە دەڕۆیتە دەرەوە بە دایك و باوكت دەڵێی چیتان دەوێت! بەڵام ئێستە دەگەڕێیت بە شوێن دەستەواژەیەكی جوانترو شیرینتر ئەوەی كە لەمە باشترە..

سبحان الله!! ئەوەی كە جیاوازە نەبرەی دەنگ و ووشە جوانەكانە.. ئەوەی كە جیاوازە تۆ باشتر بویت..

## بەڵام لای خوا بە بەهای!!

هاوەڵێك هەبوو ناوی زاهر بوو.. ڕوكاری جوان نەبوو وە لە مامەڵەشدا زۆر ڕەق بوو.. بۆیە هاوەڵان زۆر نارەحەت دەبوون بە مامەڵە كردن لەگەڵیدا.. تەنانەت ڕایان دەكرد لێی ، تەنها پێغەمبەر﴿ﷺ﴾نەبێ،

خۆشەویستی بۆ دەردەبڕی و بە نەرمی و سۆزەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرد.

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ)بە بازاڕدا دەڕۆیشت، زاهیری بینی،لە دواوە ڕۆیشت و باوەشی پیادا کرد، بەڵام وتمان کەسێتیەکی قورسی هەبوو، بۆیە وتی: ئەوە کێیە وا دەکات؟ بەرمدە، پێغەمبەر(ﷺ) بەریداو زاهر ئاوڕی دایەوە بینی پێغەمبەری خوایە(ﷺ).

زاهر دەڵێ: بەهیچ دڵخۆش نەبووم هێندەی ئەوەی بەوە دڵخۆش بووم کە لاشەم بەر لاشەی پێغەمبەر بکەوێت(ﷺ). پاشان پێغەمبەر(ﷺ) دەستی زاهری گرت و بە پێکەنینەوە دەیفەرموو:

(کێ ئەم بەندەیەم لێ دەکڕێ.. کێ ئەم بەندەیەم لێ دەکڕێ؟).

زاهیر وتی دەبینی ئەی پێغەمبەری خوا بازارم نیە.. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی:

(بەڵام تۆ لەلای خوا بە بەهای). ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

ئەمە چیە؟!سوێند بەخوا ناتوانی ئەمە وەسف بکەیت.. چۆن دەتوانی هەست و شعورێکی لەو جۆرە وەسف بکەی.. ناتوانیت مەگەر تەنها ئەوەندە بڵێیت ئەوە چاکەکاریە..

## کێ جوانگوفتار و قسە بەجێ ترە..

**لە وێنەکانی چاکەکاری لە قسەدا: بانگەوازە بۆلای خوا...**

**خوای گەورە دەفەرمووێ:**

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ فصلت: ٣٣

**واتە: جا کێ لەو کەسە جوانگوفتار تر و قسەبەجێ ترە کە بانگەوازی کردوە بۆ لای خوا ، کاروکردەوەی چاکیشی ئەنجام داوە و وتوشێتی : بەڕاستی من لەریزی موسوڵمانانندام.**

کێ لە تۆ جوانگوفتارتر و قسە بەجێترە..؟ ئەی ئەوەی سەبارەت بەدین قسە بۆ خەڵك دەکەی!

ئەگەر دەتەوێ چاکەکار بیت لە قسەکردندا.. با لەچوار چێوەی دیندا بێت.. ئایا ئەوەی کە دەیڵێم ئاسانە یان.....؟

انشا الله ئاسانە.

## چاکەکاری لە هاوسەرگیریدا..

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾النساء: ١٩

**واتە: هاوژینیان بەجوانی لەگەڵدا بەرنەسەر.**

زانایان لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرمون:

ئەمە ئەوە ناگەیێنێت کە کاتێك هاوسەرت باش بوو لەگەڵتدا و چاکەکار بوو تۆش چاکەکاربی.. بەڵکو مانای ئەوەیە کە کاتێك ئەو خراپ بوو لەگەڵتدا تۆ باش بیت، چاکەکار بیت.. ئەوە ڕەفتار و گوفتار چاك بوونە لەگەڵیاندا.. بۆ؟

لەبەر ئەوەی دەگونجێ هەندێك جار لە تەبیعەتی ئافرەت بێت کە ئازاردەر بێت.. وابزانم هێڵی سورمان بڕی.. خوایە ڕزگارمان کەیت!!چاکەکاربە لەگەڵ هاوسەرەکەتدا لەهەموو شتێکدا..و سەرەتاش

چاکەکار بە لە هەڵبژاردنی هاوسەردا.. ئاممان نەکەیت تەنها چاو و قژ و ڕووی جوان هەڵبژێری.. ئاممان تەنها بڕوانامە نەخوێنیتەوە..
**گەنجان شتێکتان پێ دەڵێم کە لەدڵمەوە دەردەچێت:**
سەیری کەس وکاری بکە.. سەیری دایك و باوکی بکە.. سەیری دینی بکە.. سەیری ڕەوشتی بکە.. پاشان سەیری شتەکانی تر بکە.. تۆ خێزانێك دەهێنیت.. تۆ ڕەوشت دەهێنی.. ئەوە چاکەکاریە.. لە هاوسەرگیریدا..

## چاکەکاری لە هەڵبژاردنی شوێنی نیشتەجێبووندا..

لە چاکەکاریە مرۆڤ شوێنیك هەڵبژێرێت بۆ نیشتەجێبوونی کە گونجاو بێت..
دیارە کە پێغەمبەر(ﷺ)هەموو خێزانەکانی لەدەوری مزگەوتدا دەژیان و شوێنێکی بیابانیش بوو..
بەڵام کاتێك (ماریەی مصری)ی هێنا مصریش وڵاتی نیل و سەوزاییە، شوێنیکی بۆ دابین کرد کەلە ئاو و هەوادا لە مصر دەچوو، شوێنەکەش ناوی (عوالی) بوو..
ئایا شتی وا دەگونجێ؟ پێغەمبەری گەورە.. کە داوای لێکراوە ئوممەت چاك بکات، وە خەڵکی لە تاریکیەکان دەربهێنێ بەرەو ڕووناکی.. ئەم شتە بچوکانەی لێ ون نەبێ! بەڵێ ئەمە ئەو نهێنیەیە کە لە ڕوشەی چاکەکاریدا خۆی حەشارداوە..
زانیاریەك کە میسریەکان دڵیان پێی خۆشە..
پێغەمبەر(ﷺ)بەهاوەڵەکانی ڕاگەیاند:

**رەوشتی باوەڕدار**

﴿إنكم ستفتحون مصر، فأحسنوا إلى أهلها، فإن لهم ذمة و رحما﴾ يان ﴿ذمة و صهرا﴾.

**واتە: ئێوە وڵاتی میصر ئازاد ئەکەن ، باشبن لەگەڵ خەڵکەکەیدا، چونکە ئەوان دۆستایەتی و ناسیاوێتی وخزمایەتی لەگەڵماندا هەیە .**

**دەبینم بەمە دڵخۆش بوون.. کەواتە چاکەکار بن خوا ڕێزتان لێ دەگرێ..**

## چاکەکاری لە تەڵاقدا..

**خوای گەورە دەفەرمووێ:**

﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ ﴾البقرة: ٢٢٩

**واتە: تەلاقێك -کەپیاو بتوانێت هاوسەرەکەی تێدا بگێڕێتەوە- دوو جارە -پیاو بۆی هەیە تەڵاقی هاوسەرەکەی بدات و چاکترین شێوازی ئەوەیە کە لە سوننەتی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ هاتوە- لەوەودا واتە بۆ سێهەمجار ئیتر ئەگەر دەیەوێت ژیانی هاوسەریی بباتە سەر نابێت تەڵاق بێت بەدەمیدا و ئەگەر هات دەبێت بەچاکی و بە ڕێك و پێکی دەستبەرداری بێت.**

**یاالله.. بیربکەرەوە.. چاکەکاری گەیشتە کوێ!! تەنانەت لە تەڵاقیشدا..**

## چاکەکاری لە گوێ گرتندا..

**خوای گەورە دەفەرمووێ:**

﴿ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓ ﴾الزمر: ١٨

**واتە: ئەوانەی گوێ بۆ قسەو گوفتار دەگرن و پەیڕەوی چاکترینی دەکەن.**

**ئەو شتانە دەستنیشان بکە کە دەتەوێ گوێت لێیان بێت.. نەکەی ووشەی خراپ گوێ لێ بگری .. ووشەیەکی ناشرینی بێسود.**

دەبینم لەمەبەستەکە تێگەیشتوویت..

## چاکەکاری ئافرەت لەماڵەکەیدا..

هەروەها لە وێنەکانی چاکەکاری، چاکەکاری ئافرەتە لە ماڵەکەیدا.. لە پاکوخاوێنی و خواردن ئامادەکردن و پەروەردەی منداڵ.. چاکەکاری لە گرنگیدانت بە ماڵەکەت..

سبحان الله!! دەکرێ تۆ خواردنەکەت بە جۆرێکی(.........) ئامادە بکەیت و مێردەکەشت بە بێدەنگ بیخوات!! بەڵام نا چاکەکار بە لە ئامادەکردنی خواردندا..

بیربکەرەوە.. چەند گرنگی بە ماڵەکەت بدەیت.. هێندە لای خوای گەورە چاکەکار دەبیت، ئایا لەئەمڕۆ بەدواوە ماڵەکەت بە شپرزەیی دەبینیت..؟ ئایا کاغەز لێرە و لەوێ کەوتووە..؟ ئایا لە ئەمڕۆوە ئەوە دەبینیت؟.... نا، تۆ لە ئەمڕۆوە بویتە یەکێك لە چاکەکاران.

## چاکەکاری بەرامبەر گیانداران..

کابرایەك دەیویست مەڕێك سەر ببڕێت.. مەڕەکەی پاڵخستبوو ئەوجا چەقۆکەی تیژ دەکردەوە.. پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی:

(دەتەوێ دووجار بیکوژی؟) پیاوەکە وتی: ئەی چیبکەم ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی(ﷺ) :

(جارێ چەقۆکەت تیژبکە و ئینجا پاڵی بخە). حاکم ڕیوایەتی کردوە.

ئەمڕۆش کۆمەڵەکانی تایبەت بە مافی گیانداران لەم فەرموودەیەوە فێردەبن و هەڵی دەواسن بە نوسینگەو مەڵبەندەکانیاندا..

## ڕەوشتی باوەڕدار

چ دینێکی گەورەیە تەنانەت فێری چاکەکاریمان دەکات لەگەڵ گیاندارانیشدا!!..

## چاکەکاری لە پیشەکەتدا..

ئەم وێنەیە زۆر پێویستە لەم سەردەمەدا.. هیواخوازی ئەوەین بەرهەمێك ببینین لێی نوسرابێت: (**بەرهەمێکی ناوخۆییەو بەچاکی بەرهەم هێنراوە**)!....

چاکەکاری لە پیشەدا ئەمڕۆ پێویستیەکی سەرشانی هەموو کەسێکە.. گەر دەتەوێ وڵاتەکەت پێشبکەوێ و ڕاپەڕێ و گەشەبکات.. چاکەکار بە..

## سوپاس بۆ خوا موسڵمان بووم پێش..

لاحول ولاقوە الا بالله.. ئایا دەگونجێ وێنەیەکی خراپ بێن بۆ ئیسلام؟ بۆچی؟ لە بەرئەوەی ڕەوشت و هەڵسوکەوتمان زۆر دوورە لەئیسلامەوە.. وە یەکێك لەو ڕەوشتانە چاکەکاریە..

لەبیرتان بێت.. کاتێك پیاوێکی ئەجنەبی موسڵمان بوو، پاشان تێکەڵاوی موسڵمانان بوو ووتە بەناوبانگەکەی ووت:

**( سوپاس بۆ خوا موسڵمان بووم پێش ئەوەی موسڵمانان بناسم).**

تکات لێ دەکەم.. ئەم ووتەیە ئازارت نادا؟ کەواتە دیسان پەیمانەکەت نوێ بکەرەوە و بڕیاربدە لەسەر ئەوەی کە چاکەکاربیت.

## لە حەزرەتی یوسفەوە فێر ببە!!

سەیری چاکەکاری گەورەمان یوسف بکە و لێیەوە فێرببە.. فەرمووی:

﴿ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنبُلِهِ ﴾ یوسف: ٤٧

واتە: حەوت ساڵی بەردەوام کشتوکاڵ دەکەن و دانەوێڵە دەچێنن ، ئەوەی کە دروێنەتان کردوو لێتان زیاد بوو بەگوڵەکەیەوە بیهێڵنەوە .

ئەمەش سیاسەتی پاشەکەوت کردنە ، پاشان:

﴿ ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ ﴾ یوسف: ٤٨

واتە: پاشان لەدوای ئەوە حەوت ساڵ گرانی و سەختی پێش دێت ، ئەوەی کە زەخیرەتان کردوە بۆ ئەو ساڵانە هەمووی دەخۆن .

ئەمەش سیاسەتی سەرفکردنی بەبەرنامەیە بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێت لەو قەیرانە.

سبحان الله!! بینیتان چاکەکاری و پەیوەندی بە نەخشەسازی و ئابوری و زانستی بەڕێوەبردنەوە؟ .

ئایا حەقە شانازی بە دینەکەتەوە بکەیت یا نا؟

بەڕاستی ئەم دینە دینێکی گەورەو گشتگیرە...

شایستەی کەسانی چاکەکارە..

## هەتا دواسنور..

ئەم ڕەوشتی چاکەکاریە زۆر سەیرە... لەگەڵماندا دێتە شوێنی واوە کەوا نازانین پەیوەندیەکی پێوە هەبێت، ئیستە باوەڕی چەسپاومان بەوە هەیە کە هەموو ژیانمان پێویستی بە چاکەکاری هەیە.. وا دەزانم ئەم هەستە لای تۆش دروست بووە.. وانیە؟.

# ڕەوشتی باوەڕدار

## هەموو دین دەگرێتەوە..

**ئیبن قەییم دەفەرموێ سەبارەت بە ڕەوشتی چاکەکاری:**

**(ناوەڕۆکی باوەڕە، ڕوحی باوەڕە، تەوای باوەڕە، هەموو کارەکان لە نوێژو ڕۆژوو و حەج و زکرو...هتد دەچنە ژێر ناوی چاکەکاریەوە).**

**من پێم نەوتن ئەمە ڕەوشتێکە هەموو دین دەگرێتەوە هەموو ئیسلام دەگرێتەوە..**

## کوێرانە شوێن مەکەوە..

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ:**

﴿لا تكونوا إمعة تقولون: إن أحسن الناس إحسنا وإن ظلموا ظلمنا. ولكن وطنوا أنفسكم. فأن أحسن الناس أن تحسنوا وإن ظلموا فلا تظلموا﴾.

ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هەرگیز پاشکۆی خەڵکی مەبن! بڵێن: گەر خەڵی چاکبو ئەوا ئێمەش چاك دەبین، گەر ستەمیان کرد ئێمەش ستەم دەکەین، بەڵام خۆتان دامەزراو بکەن، ئەگەر خەڵکی چاکەی کرد ئێوەش چاکەکاربن، گەر ستەمیشیان کرد ئەوا ئێوە هەرگیز ستەم مەکەن .**

**سوێند بە خوا ئەم فەرمودەیە وەڵامی ئەو قسانەیە کە دەڵێ:**

**(من چۆن چاك بم لەکاتێکدا هەموو خەڵك خراپە؟).**

**چۆن دەتەوێ کاغەزەکە فڕێ نەدەمە سەر شەقامەکە لە کاتێکدا شەقامەکە پڕە لە کاغەز؟! لە بیرت بێت تۆ موسڵمانیت ئەگەر هەموو جیهان خراپەکار بێت دەبێ تۆ چاکەکار بیت.. مەڵێ من چیم پێدەکری دنیا هەمووی.......**

ئەگەر بەم شێوەیە بیرنەکەینەوە ئەی باوەڕو نوێژو خوێندنەوە چی بۆ زیاد کردوین...؟!.

## نـــه زیادەڕەوی و نـــه کەمتەرخەمی..

ئەمە خاڵێکی خۆشە!! پاش خوێندنەوە هەندێك دەڵێن: لە ئێستەوە دەبی لە چاکەکاران بم... ئیتر شتی سەیر دەبینیت.. توشی دوودڵی و وەسوەسە دەبێت..

سڵاو لە دایك و باوکی دەکات و لە دەرگاکە دەچێتە دەرەوە.. پاش کەمێکی کە دێتە ژورەوە و دیسان سڵاویان لێدەکاتەوە، دەڵێت: دەترسم نەمتوانی بێت چاکەکاربم!..

ئافرەتێك لەماڵەوە دەڵێت: دەبێت خواردنەکەم زۆر چاك دروست بکەم.. ئیتر کارەکە لەسەر خۆیان قورس دەکەن، ماندوو دەبن و توشی بێتاقەتی دەبن..

لەسەرخۆبە.. نەکەی توشی وەسوەسە و زیادەڕەوی ببیت لە ڕەوشتی چاکەکاریدا...

## تێی بگە پاشان لەبەری بکە..

هەموو ڕەوشتێك لە ئیسلامدا درو جەمسەرە، پێویستە تۆ خۆت بخەیتە ناوەڕاستیانەوە.. بۆ نموونە ئازایەتی نێوانی هەڵەشەیی و ترسنۆکیە، بەخشندەی نێوانی چروکی و دەست بڵاویە، چاکەکاریش نێوانی زیادڕەوی و خراپەکاریە..

## ڕەوشتی باوەڕدار

جائیتر هەوڵبدەن و نزیك ببنەوە لەم ڕەوشتە بە پێی توانای خۆتان، ئاگاداربە نەکەی زیادەڕەوی یان کەمتەرخەمی تیادا بکەی.. چاکەکار بە بەپێی توانا خوا یارمەتیت دەدات..

## وریابە... تۆ ئێستە ئاوێنەی بۆ ئیسلام..

تۆ ئێستە بویتە دوانگەیەك و بەبەردەم خەڵکیدا دەڕۆیت... نەکەی بە ڕەوشتی ناشرین ئیسلام و موسڵمانانیش ناشرین بکەیت... تۆ ئێستە ئاوێنەی بۆ ئیسلام، بۆیە پێویستە چاکەکار بیت.. ئەگەر وات کرد ئیسلام وموسڵمانان بەرز دەکەیتەوە.

لە بیرت بێت:

﴿إن الله كتب الاحسان على كل شيء﴾.

چاکەکاری لە هەموو ئەوانەی کە باسمان کرد..

وە بزانە:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ الرعد: ١١

**واتە: بێگومان خوا بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێك ناگۆڕێت هەتا ئەوان ئەوەی بەخۆیان دەکرێت نەیگۆڕن.**



# خاكی بوون

## تەسلیم بوون بە حەق و وەرگرتنی

## لە هەرکەسێکەوە بێت..

کاتێك دەبیستی فلانە کەس خاکیە چ هەستێکت لا دروست دەبێت......!!

تۆ ناتوانی بە زمان ئەو هەستە ناوەکیە دەربڕی کە لەلات دروست بووە سەبارەت بەم ڕەوشتە بەرزە .. لەبەر ئەوە پێویستە مانای خاکیبوون بزانیت ..

## خاکی بوون دوو مانای هەیە:

**مانای یەکەم :**

تەسلیمی ڕاستەقینە و حەق ببیت و قبوڵی بکەیت ئیتر لە هەر کەسێکەوە بێت .

هەندێك کەس هەیە حەق وەرناگرێت تەنها مەگەر لە کەسانێکەوە بێت کە لەخۆی گەورەترن ، خۆ ئەوە گەر خاوەن حەقەکە لە خۆی بچوکتر یان پلە خوارتر بوو ئەوا بە هیچ جۆرێك وەری ناگرێت .... بەڵام خاکیبوون ئەمە نیە .، وەرگرتنی حەق و ڕاستەقینە لە هەرکەسێکەوە بێت .. هەژارو دەوڵەمەند ، بە هێز و لاواز ، دۆست و دوژمن ، بە دەستەڵات و بێ دەستەڵات..

## ڕەوشتی باوەڕدار

ئایا تۆ لەوانەی کەحەق ویستن و سەیری بەرامبەرەکەیان ناکەن چیەو کێیە .. ؟ پێش ئەوەی وەڵام بدەیتەوە ، داوات لێ دەکەم لەووشەی: (هەرکەسێك) زۆر ورد ببیتەوە ..

**مانای دووەم :**

ئەوەیە کەباڵت ڕاخەی بۆ خەڵکی .. مانای باڵ ڕاخستنیش ئەوەیە کە .. بە نەرمی و خۆشەویستی مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکەیت هەرچۆنێك بن..

کرێکار و خاوەن کار ، گەورەو بچوك ، بە دەسەڵات و بێ دەسەڵات..

ئایا دەتوانی مامەڵە لەگەڵ سەرجەم مرۆڤەکاندا بکەیت بەو پەڕی سۆز و بەوپەڕی نەرمی و بەوپەڕی خۆشەویستی ؟

**پێداچونەوە :**

زانیمان کە خاکیبوون دوو مانای هەیە .

**یەکەم :** تەسلیم بوون بە حەق و حەقیقەت و قبوڵ کردنی لە هەرکەسێکەوە بێت .

**دووەم :** باڵ ڕاخستە بۆ خەڵکی و مامەڵە کردنیان بە نەرمی و خۆشەویستی .

وادەزانم کەسێکی خاکیت ، بەڵام لە خاکیبوونەکەت ڕازیت ...؟ خوا لە خاکیبوونەکەت ڕازیە ...؟

کەواتە .. هەوڵ بدە و بە باشی لەم دوو مانایە تێ بگە و و هەوڵی جێبەجێکردنی بدە ، خواش لە گەڵتە و یارمەتیت دەدات .

## بناغەی ئەم دوو پێناسەیە..

ئاشکرایە کە پێچەوانەی خاکیبوون خۆبەگەورە زانیە... کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)پێناسەی خۆ بەگەورەزانی دەکات دەفەرموێ:

﴿ الكبر بطر الحق ، و غمط الناس ﴾ موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

واتە: خۆبەزلزانین بەرپەرچدانەوەی حەقوڕاستیەکانە و بەکەم سەیرکردنی خەڵکیە .

﴿ بطر الحق ﴾ بە واتای: قبولْ نەکردنی حەق دێت ، لێرەوە مانای یەکەمی خاکیبوونمان وەرگرت .

﴿ غمط الناس ﴾ بەواتای: لوتبەرزی لەنێو هەژار و کەمدەستان دا دێت.

خۆت بە بەرزتر دەبینیت ، سەلام لەو ناکەیت و بەدەم ئەمەوە پێ ناکەنیت و قسە لەگەڵ ئەودا ناکەیت بە واتای:( ستەم کردن لە خەڵکی و پێ نەدانی حەقی خۆیان ). لێرەشەوە مانای دووەمی خاکیبوونمان وەرگرتووە .

ئایا وەکو ڕۆژی ڕوناك باسەکەت بۆ ڕوون نەبۆتەوە ؟

ئایا زانیت کە پێچەوانەی خاکبوون خۆ بەگەورە زانینە ؟

ئێستا بزانە کە ئەگەر خاکی نەبیت کەواتە ..........!!.

# گەورەیی خاکی بوون

## هەر کەس لەبەر خوا خاکی بێت

## خوا بەرزی دەکاتەوە ..

**پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾دەفەرموێ:**

﴿ما تواضع احد لله الا رفعه الله ﴾. موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هەرکەس لەبەر خوا خۆبەزل نەگرێ (بەڕێزەوە سەیری خەڵکی بکات) ئەوا خوای گەورەش ئەو بەرزو بڵندو بەڕێز دەکات ..**

سبحان الله.. پێچەوانەکەشی ڕاستە چەند مرۆڤ خۆ بەگەورەزان بێ خەڵك خۆشی ناوێ ، لە پلەی کەم دەبێتەوە .

ئایا حەز ناکەیت خوای گەورە پلەو پایەت بەرز بکاتەوە .. !؟

گوێم لێتە دەڵێی : بەڵێ ، کەواتە خاکی بە .

## یاالله ...!! بەرزترینی بەرزترینەکان ؟

**پێغەمبەر﴿ﷺ﴾دەفەرموێ:**

﴿ من تواضع لله درجة رفعه الله درجة حتى يبلغ اعلى عليين . و من تكبر على الله درجة وضعه الله درجة حتى يبلغ اسفل سافلين ﴾.

ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هەرکەس پلەیەك خۆ بەسادەو بچوك بگرێت، ئەوا خوای گەورە پلەیەك بەرزی دەکاتەوە تا دەگاتە سەرو هەمو پلە بەرزەکان، هەکەسێکیش پلەیەك خۆ**

لەئاست خوا بەمەزن بزانێت خوای گەورەش پلەیەك دایدەبەزێنێت تا دەگاتە نزمترینی پلە نزمەكان .

چ پلەیەكی بەرز و جوانە بۆ باوەڕداری خاكی ڕزگار بوو . وە چ پلەیەكیش بۆ خۆ بە گەورەزانانی تیا چوو!!.

لەخۆت بپرسە ئێستا تۆ لە چ كۆمەڵێكیان دای ؟ وە لە چ پلەیەك دایت ؟ وەڵامەكە هەر كامێكیان بێت : ئایا لەوەدا لەگەڵمدا نیت كە پێویستیت بە ڕەوشتی خاكیبوون هەیە ..!!؟ ئیتر چاوەڕوانی چیت ؟!.

## خاكی بن : بە فەرمان !!

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ:

«إن الله أوحى إلى أن تواضعوا . حتى لا يفخر أحد على أحد و لا يبغي أحد على أحد »

ئەبوداود ڕیوایەتی كردوە.

واتە: خوای گەورە نیگاو سروشی بۆ ناردم تا ئێوە گەردن نزم بن لەئاستی یەك ، تا هیچ كەسێك فەخر نەكات بەسەر كەسێكی دی ترداو كەسیش ستەم لەوی تر نەكات .

گەر تۆ خۆت بە گەورەتر دەزانی لە دروست كراوەكانی خوا وە ڕازیش نیت لەم كارەت و دەتەوێ خۆت چاك بكەیت ئەوا ئامۆژگاریت دەكەم بە خاكیبوون ... ئایا ئەمە بەس نیە ؟ زانیت كەواتە پابەند بە.

## زەوی نزیكترین ڕێگەیە بۆ ئاسمان..

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ خوای گەورە دەفەرموێ:

## ڕەوشتی باوەڕدار

(هەرکەس خاکی بێت بەم شێوەیە) وە پێغەمبەر(ﷺ)بە ناولەپی دەستی ئاماژەی بۆ زەوی کرد و پاشان دەستی بەرەو زەوی داگرت دەڵێن : ئەوەندە دەستی داگرت هەتا نزیك زەوی بووەوە ئینجا فەرمووی خوای گەورە دەفەرموێ:( بەم شێوەیە بەرزی دەکەمەوە )، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی هەڵگێڕایەوە هەتا توانی بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان .

سبحان الله.. چەندە خاکی بیت لە مامەڵە کردنت لەگەڵ خەڵکیدا ئەوەندە خوای گەورە بەرزت دەکاتەوە ... سەیری وێنەو نمونەکە بکە ... وە بە تایبەت هەردوو ووشەی ئاسمان و زەوی .

**هەڵوێستەیەك :**

خاکیبوونی زەوی وای کردووە ئێمە بە قاچەکانمان بەسەریدا بڕۆین ، بەهۆی ئەوەوە ئەو پلەیەی دەست کەوتوە کە ئێمە ناوچەوانمانی بخەینە سەر و سوجدەی لەسەر بەرین ... ئەمە چ گەورەییەکە ... ؟

## ناچێتە بەهەشتەوە ؟ خوایە بمان پارێزە..

**پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێ :**

﴿ لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر ﴾. موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: ناچێتە بەهەشتەوە کەسێك تۆسقاڵێك خۆبەزلزانی لەنێو دڵدا بێت .**

**لە ڕیوایەتێکی تردا:**

﴿ لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال خردل من كبر ﴾.

ئێستە لە خۆت بپرسە ... ئایا بەقەدەر مسقاڵە زەڕڕەیەك خۆ بەگەورەزانی لەدڵتدا هەیە ؟ بە ڕاستی فەرمودەکە لەوپەڕی گرنگی دایە

... له ڕۆژی دوایدا نوێژ و ڕۆژوو و زەکات وحەج و کردارە چاکەکانت و ... بەڵام خۆ بەگەورە زانیت تیا بووە ئیتر ناچیت بەهەشتەوە ، تکایە تۆش خواپەرستی ڕەوشت ناشیرین مەبە .. دەست بە گۆڕانکاری بکە .

## ململانێ لەگەڵ خوا دەکەی ...!؟

**خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسی‌دا دەفەرموێ:**

﴿ الکبریاء ردائي و العزة إزاري فمن نازعني فیهما عزبته ﴾.

ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: مەزنی هەیبەتی منە ، بەعیززەت بون تواناو دەستەڵاتی منە، هەرکەس کیبرکێیان لەسەربکات لەگەڵمدا سزای دەدەم .**

**لەبەرخوا خاکی بن.. لە گەورەیدا ململانێی لەگەڵدا مەکەن ... ئایا حەزتان لە نیعمەتەکانی بەهەشت نیە ؟ ئایا لە سزای ئاگر ناترسن..!؟.**

## گوێ بۆ ئامۆژگاریەکانی لوقمان بگرە..

**خوای گەورە لە ئامۆژگاریەکانی لوقمان بۆ کوڕەکەی دا ئەفەرموێ :**

﴿ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾ لقمان: ١٨

**واتە: هەروەها ڕووت وەرمەگێڕە لە خەڵکی و لوتبەرزمەبە و بەچاوی سوك سەیریان مەکە-بەسەر زەویدا بەناز و فیزەوە مەڕۆ ، بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە خۆهەڵکێش و فەخرفرۆش و فیزاوین .**

**ئایا ﴿ تُصَعِّرْ ﴾ واتای چیە ؟**

**الصعر : نەخۆشیەکە توشی ئەژنۆی ووشتر دەبێت ،کاتێك توشی بوو جارێکی تر ئەژنۆی ناچەمێتەوە و ملی زیاتر درێژ دەکات .**

سەیری نمونە جوانەکانی قورئان بکە ... هەست دەکەم ئێستە ئێوە وێنەکەتان لە پێش چاوە کە چۆنە ..

پرسیار :

دەنگ و باسی ئەژنۆی تۆ چۆنە !؟.

## چەند وێنەیەك بۆ جێبەجێ کردن

## خاکیبوون ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ)بوو..

هاوەڵان ( ڕەزای خوایان لێ بێت ) دەفەرموون:

( کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) سڵاوی دەکرد دەستی دانەدەگرت هەتا کەسی بەرامبەر دەستی دانەگرتایە ، وە کاتێك سڵاوی دەکرد بە هەموو گیانی سڵاوی دەکرد ، ڕوی وەرنەدەگێڕا هەتاکەسی بەرامبەر ڕوی وەرنەگێڕایە ، لە ناو کۆڕ و کۆبونەوەدا هەڵنەدەستا هەتا تەواو نەبوایە ، هەمیشە دەم بە خەندە و پێکەنین بوو ) .

یاللە ... ئێمە لە کوێ و ئەم خەسڵەتانە لە کوێ ... تۆ بەوپەڕی خێرایی سڵاو لە خەڵکی دەکەیت ، دەڵێیت : ( من سەرقاڵم ).

ئایا تۆ لە پێغەمبەر (ﷺ) سەرقاڵتری ؟

ئایا کە سڵاو دەکەیت بە هەموو بونت سڵاو دەکەیت یان تەنها بەدەستت سڵاو دەکەیت و بەدڵ و لاشە لە شوێنێکی تری و ڕوت کردوٚتە لایەکی تر و سەیر ناکەیت ..؟.

ئایا لە کۆڕ و دانیشتنەکاندا چۆن هەڵسوکەوت دەکەیت و خەڵك چۆن دەبینیت ؟.

ئەگەر ئەم خەسڵەتانە لەخۆتدا بەرجەستە بکەیت ئەوە تۆ کەسێکی خاکیت ... وە من دەزانم تیاتاندایە یەکێك لەو خەسڵەتانەی تیایە . وە تیاتاندایە دوانیانی تیایە و تیاتاندایە .........

خۆشەویستان :

لە خاکیبوونی پێغەمبەری خواوە فێر بن ، دەفەرمویٚ:

﴿ إن الله خيرني أن أكون ملكاً نبياً أو عبداً نبياً فاخترت أن أكون عبداً نبياً ﴾ هندی ڕیوایەتی کردوە.

واتە: خوای گەورە سەرپشکی کردوم تا پاشەیەتی و پێغەمبەرێتی بکەم ، یاخود بەندایەتی و پێغەمبرێتی بکەم، بەڵام من ئەوەم هەڵبژارد بەندەو پێغەمبەربم .

بەڕاستی زۆر تامەزرۆی بینینی محمدین(ﷺ).

ئایا تۆش تامەزرۆی بۆی !!؟.

## لەسەرخۆ بە ...!!

لە خاکیبوونی پێغەمبەر (ﷺ):

جارێك پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)زۆر شپرزە بوو بوو دەلەرزی (وای دەزانی چوەتە لای یەکێك لە پادشاکان).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :

( لە سەر خۆبە من پادشا نیم ، من کوڕی ئافرەتێکم گۆشتی وشك بووەی خواردووە لە مەککە ). ئیبن ماجە و حاکم ڕیوایەتیان کردوە.

ئایا تۆ تائێستا کەسێك هاتۆتە لات لێت ترسابێت و پێت وتبێت : من کوڕی جوتیارێکی ئاساییم ؟ ... سەیری خاکیبوونی پێغەمبەر (ﷺ) بکە ، نەکەی لەو کەسانە بیت کە خۆیان بەگەورە دەزانن .

## فێربن ئەی نەوەکانی سەدەی بیست و یەك ...!!

سەیری ئەم هەڵوێستە بکە ، بزانە تا چ ئاستێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ خاکی بووە .. دەڵێن : کچێکی بچوك چەند شتێکی پێویست بوو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەستی گرتووە و لەگەڵیدا چۆتە بازاڕ و پێداویستیەکانی کڕیوە و هەتا هاتونەتەوە دەستی بەرنەداوە..

ئەمە چیە ...!؟ برا بچوکەکەت پێت دەڵێت : لەگەڵمدا وەرە ئەو شتە دەکڕم ، بەڵام تۆ وەڵامی دەدەیتەوە و دەڵێیت : ( ......... ).

ئەی نەوەکانی سەدەی بیست و یەك خاکی بن و شوێن پێی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هەڵگرن ... ئەوەی کە ئەمڕۆ بەوجۆرەیە زۆر کەمن ، ئایا تۆ لەوانەی .. !؟.

## یاالله.. لاشەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ تۆز دایپۆشیوە !!

هەر لە خاکیبوونی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە ڕۆژی خەندەقدا :

هەندێك لە هاوەڵەکان کاری هەڵکەندنیان دەکرد ، هەندێکی تر بەردیان دەشکاند ... هەڵکەندن و شکاندنیش تا ڕاددەیەك کارێکی پاکە ، ئەی تۆ چی دەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾؟

ئایا سەرپەرشتی دەکرد ؟ خەریکی هەڵکەندن بوو ؟ بەردی دەشکاند ؟ نا .. ئەو ﴿ﷺ﴾خۆڵەکەی هەڵدەگرت بەشانی و دەری دەهێنا لە چاڵەکەوە بۆ سەرەوە کە سێ مەتر قووڵ بوو ... هاوەڵان دەفەرموون : سوێند بەخوا لاشەی پێغەمبەرمان بینی ﴿ﷺ﴾ خۆڵ و تۆز دایپۆشیبوو.!!

دەبینم بە لاتەوە سەیرە دەڵێیت : ئایا لاشەی پێغەمبەریان بینی ؟!
بەڵێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە جددی کاری دەکرد، بەڵام سەیری حاڵی ئەمڕۆمان بکە ... دەبینی سەرپەرشتی کار و بەدواداچوونی هەیە بەڵام کار ناکات، سەیری پێغەمبەریش بکە ﴿ﷺ﴾ کارە هەرە قورسەکەیانی هەڵبژاردبوو ، بەسەر شانی خۆڵی هەڵدەگرت ﴿ﷺ﴾ ..
تۆش هێزی خۆت ، خاکیبوونی خۆت پیشانی خوای گەورە بدە ...
بچۆرە لای دایکت قاپەکانی بۆ بشۆ ،ماڵەکەی بۆ گسك بدە و...
تۆ ناتەوێت خاکیبوونەکەت کرداری بێت ...!؟.

## لە ئەمڕۆ بە دواوە هیچ بە هانەیەکت نیە ...!!

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾هەمیشە هاوکاری خێزانەکانی دەکرد ، جلەکانی دەدووریەوە و نەعلەکانی چاك دەکرد و شیری دەدۆشی و خۆی بە کارەکانی خۆی هەڵدەستا ). ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.
ئەمە چیە ؟ ئەوە پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾... چۆن ئەو کارانەی کردووە ؟
بەلاتەوە سەیرنەبێ خاکیبوون بەم شێوەیەیە.
( کەسێك ناچێتە بەهەشتەوە مەگەر دەبێ لە دوای پێغەمبەرەوە بێت ).
لە خاکیبوونی پێغەمبەری ئینسانەوە فێر ببە.
دەبینم تۆش لە دڵەڕاوکێدا بووی ... زمانی حاڵت دەڵێت:
( لە ئەمڕۆ بەدواوە هیچ بەهانەیەکم نیە ... !! لە ئەمڕۆوە دەچیتە بازاڕ، لە ئەمڕۆوە هاوکاری کەس و کارت دەکەیت .. نییەتت نوێ بکەرەوە و شوێن پێی پێغەمبەرەکەت هەڵگرە و خاکی بە .

## دەگەڕێم بۆ گەردانەیەك !! تا ببێتە بەڵگە بۆت ..

لە فەتحی خەیبەردا بیست ئافرەت هەبوون کە یەکێکیان کچێکی بچوك بوو ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێی فەرموو:( وەرە لەپشت منەوە سوار بە). ڕێگەکە ( نەوەد کیلۆ مەترە ) دەڵێت : کاتێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەیویست ئیسراحەت بکات ، لەسەر ووشترەکەی دادەبەزی و چۆکی بە وشترەکە دادەدا و دەیفەرموو: دەستم بەرێ و دای دەبەزاند ..

کچەکە دەڵێت : کاتێك کە غەزاکە تەواو بوو مسوڵمانان سەرکەوتن ،پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەستکەوتەکانی دابەش دەکرد ، دەگەڕاو سەیری خەڵکی دەکرد، منی بینی : فەرمووی: وەرە .. منیش چومە لای ، گەردانەیەکی دەرهێناو فەرمووی:( بیکە ملت ) وویستم لێی وەرگرم و بیکەمە ملم بەڵام پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:( نا... خۆم دەیکەمە ملت ).

ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

ئیتر پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ خۆی کردیە ملم . کچەکە دەڵێ : سوێند بەخوا ئەو گەردانەیە هەرگیز لەملم دانەکەنراوە و وەسیەتیشم کردوە کەمردم بیخەنە گۆڕەکەمەوە تا لە ڕۆژی دواییدا بیبەم بۆ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾بڵێم ئەمە گەردانەکەیە ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ .

دەبینم چاوەکانت فرمێسکیان لێ دێتە خوارەوە لە نەرمی و ناسکی ئەم هەست و شعورە .. بەڵام سەیری خاکیبوونی پێغەمبەر بکە ﴿ﷺ﴾ لە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا .... هەموو خەڵکی ..

**پرسیار :**

**ئایا تۆ بەو شێوەیە مامەڵە دەکەیت لەگەڵ خەڵکیدا ؟**

هەست دەکەم قسەی کچەکە زۆر کاری تێ کردبێت کاتێك ووتی : وەسیەتم کردوە کە لەگەڵم بیخەنە گۆڕەکەمەوە هەتا لە ڕۆژی دوایی‌دا بیبەم بۆ پێغەمبەر و بڵێم ئەوە گەردانەکەیە ئەی پێغەمبەری خوا .. هەستێکی ڕاستگۆ لە دوای ١٤٠٠ ساڵ دەگاتە تۆ ..

بۆ گەردانەیەك دەگەڕێم بۆت ...!! تا لە ڕۆژی دواییدا بگەی بە پێغەمبەری خوا و پێی بڵێیت: لەوەتەی گوێم لێ بووە ئەی پێغەمبەری خوا من خاکیم سوپاس بۆ خوا .

## ئەمە چ خاکیبونێکە..!!؟

ئایا دەزانی پێغەمبەر(ﷺ)چۆن چووە ناو مەکە لەدوای فەتح و سەرکەوتن؟

سەری داخستبوو .. دەڵێن : هەتا بینیمان ناوچەوانی پیرۆزی کەوتە سەر وشترەکەی!!

یاالله !! پاش ئەوەی ئازاریان دا ئەشکەنجەی هاوەڵانیان دا کوشت و بڕیان لەگەڵ کردن ..!!

سبحان الله .. ئەمە چ خاکیبونێکە .. کێ وادەکات لەم سەردەمەدا .. بیهێنە پیش چاوی خۆت ،سەرکەوتنێکی گەورە .. بەڵام لەبەرامبەرەوە خاکیبونێکی گەورە ..

باڵی سۆز و خاکیبوونت ڕابخە ڕەحمەتی خوات لێ بێت.

## منیش دار کۆدەکەمەوە .. !!

پێغەمبەر(ﷺ)لەیەکێك لە سەفەرەکانیدا بوو.. داوای کرد کە حەیوانێك سەربڕن ، یەکێکیان ووتی : سەربڕینەکەی لەسەر من ، یەکێکی تریشیان ووتی : کەوڵکردنەکەشی لەسەر من ، یەکێکی ترلە هاوەڵان فەرمووی : برژاندنەکەشی لەسەر من پێغەمبەریش(ﷺ)فەرمووی:

دار کۆکردنەوەش لەسەر من ، ووتیان ئێمە بەو کارە هەڵدەستین ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەویش فەرمووی:

( دەزانم ئێوە دەتوانن کارەکە بکەن ، بەڵام حەز ناکەم خۆم لە ئێوە جیابکەمەوە خوای گەورە ئەو بەندەیەی خۆش ناوێ کە دەیبینێ خۆی جیاکردۆتەوە لە هاوەڵەکانی). ئیتر هەستاو داری کۆکردەوە .

خوایە بمانگێڕە لە خاکیەکان و خۆشەویستانی پێغەمبەرەکەت ، خوایە یارمەتیمان بدە لەسەر خاکیبوون.

## خۆزگە سەیری حاڵت بکردینایە ئەی ئەبوبکر..

بفەرموو بۆ چەند وێنەیەك لە خاکیبوونی هاوەڵان ..

ئەوە ئەبوبەکرە ( ڕەزای خوای لێ بێت ) هەڵدەستێت بە پاککردنەوەی ناو ماڵی پیرەژنێك لەکاتێکدا کە ئەو کێیە ! جێنشینی پێغەمبەرە (ﷺ).. ئەمیری مسوڵمانانە.. ئەی تۆ کێیت ؟ تۆ ماڵەکەی خۆت پاك ناکەیتەوە .. هاوکاری دایکت ناکەیت .. هاوکاری هاوسەرت ناکەیت .. کچ بە دایکی دەڵێت : ( من ئێستا سەرقاڵم .. من چومەتە زانکۆ دەکرێ ماڵ پاك بکەمەوە ).!! تۆ لەماڵەکەی خۆتدا ئەم کارە ناکەیت .. ؟ ئەی

چی دەربارەی ئەبوبکر دەڵێیت ماڵی پیرەژنێك پاك دەکاتەوە؟.شەرم ناکەیت..؟

تۆ لە کوێی ئەی ئەبوبکر تاکو حاڵی ئێمەت بزانیایە ؟.

## پرسیارێك لەوپەڕی گرینگیداو وەڵامێك لەوپەڕی ئاسانیدا..

سەیری خاکیبوونی ئەبوبەکر بکە لەم هەڵوێستەدا:

پیاوێك هاتە لای کەلە کۆمەڵی( مؤلفة قلوبهم )بوو واتە: ئەوانەی کە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾چاکەی لەگەڵدا دەکردن تا دڵیان ڕاگریٚ و ڕاکێشی بە لای ئیسلامدا و لە شەڕیان دور بێت .

بە ئەبوبەکری ووت : ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا شتێکم پێ ببەخشە، ئەبوبەکریش فەرمانی کرد کە پارچەیەك زەوی بدەنیٚ ، پاشان پێی ووت : بڕۆ و با عومەری کوڕی خەتاب شاهید بیٚ لەسەری ، پیاوەکە چوە لای عومەر و پێی ووت : ئەبوبەکر ئەمەی بۆ نوسیوم و ناردمی بۆ لای تۆ تا شاهید بیت لەسەری .. عومەر فەرمووی : سوێند بە خوا شاهید نابم لەسەری ، کاتێك ئیسلام لاواز بوو ئێوە دەتانبرد ، بەڵام ئیستا ئیسلام بەهێزە ، وەرەقەکەی لە پیاوەکە وەرگرت و دڕاندی .. پیاوەکە چوە لای ئەبوبەکر و ووتی : سوێند بەخوا نازانم کامتان جێنشینن تۆ یان عومەر !!؟ ئەبوبکر فەرمووی : (ئەو ئەگەر بیەوێت)!!.

بیر بکەرەوە .. گەر تۆ لە جێگەی گەورەمان ئەبوبەکردا بویتایە چیت دەکرد ؟ سوپاس بۆ خوا کە تۆ لە جێگەی ئەودا نیت .. بەڵام دەتوانی لەم هەڵوێستەوە فێرببی .. ؟ دەتوانی خاکی بیت .

## خۆزگە موویەك بومایە لەسەر سنگی ئەبوبەکر ..!!

ئەمەش وێنەیەکە لە عومەری فاروقەوە و فێری خاکیبوونمان دەکات ، بەڵام پێش ئەوەی ڕونی بکەمەوە ، کەسێتی عومەری کوڕی خەتابت بیر دەهێنمەوە .. هێزی گەورەمان عومەر .. بیرت بێت عومەری کوڕی خەتاب دەفەرموێ:( خۆزگە مویەکی سەر سنگی ئەبوبکر بومایە ). ئیتر لەسەر ئەم وتەیە پێوانەی خاکیبوونی بکە .. بڵێ من لەکوێی ڕەوشتی خاکیبوون دام ؟.

وەفدێك لە عێراقەوە بە سەرۆکایەتی ( ئەسنەفی کوڕی قەیس ) هاتن بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەمیری مسوڵمانان ( عومەری کوڕی خەتاب ). کاتێك گەیشتن بینیان وا عومەر خۆی خەریکی شتنی وشترەکەیەتی .. کاتێك ئەسنەفی بینی فەرمووی:( ئەسنەف وەرە یارمەتیم بدە ) یەکێك لە پیاوانی وەفدەکە وتی : ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی ئەمیری مسوڵمانان ، نەدەکرا فەرمان بکەی بەیەکێك لە کۆیلەکان وشترەکەت بۆ پاك بکاتەوە؟ عومەریش فەرمووی : جا کێ لەمن کۆیلەترە ، کێ لە ئەسنەف کۆیلە ترە، ئەی نازانیت هەرکەس کارێکی مسوڵمانانی گرتە دەست دەچێتە پلەی کۆیلە بۆیان و ئەوانیش گەورە ؟!.

یاالله ... عومەری کوڕی خەتاب خۆی وشتر دەشوات ... ئەمە چۆن .؟! ئەمیری مسوڵمانان وشتر دەشوات ..!! وەك بڵێی چیرۆکێکی خەیاڵی دەخوێنینەوە بەڵام خاکیبوون زۆر لەمە زیاتر دەکات ، گومانت لەم قسەیە هەیە ؟ تاقی بکەرەوە ئەو کات گومانەکەت دەبێتە یەقین و دڵنیایی..

## من پیاوێکم له مسوڵمانان..

له نمونه‌ی خاکیبوونه سه‌رسوڕهێنه‌ره‌کان : خاکیبوونی گه‌وره‌مان علی کوڕی ئه‌بوتالیبه.. له‌م هه‌ڵویسته‌ی سه‌رنج بده ..

له‌دوای وه‌فاتی فاتیمه گه‌وره‌مان علی ژنێکی تری هێناو کوڕێکی لێی بوو ناوی محمدی کوڕی حنیفیه بوو ڕۆژێکیان له‌گه‌ڵ کوڕه‌کانی دانیشتبوو ، محمد پێی ووت : باوکه کێ باشترین مسوڵمانه دوای پێغه‌مبه‌ری خوا ؟ علی فه‌رمووی : ئه‌بوبه‌کر ، ووتی دوای ئه‌و ؟ فه‌رمووی : عومه‌ری کوڕی خه‌تتاب ، بۆیه وتم پاشان تۆ ، فه‌رمووی : ڕۆڵه گیان من که‌سێکم له مسوڵمانان .

گوێم لێته ده‌ڵێی : هه‌ر ده‌بێ وا بڵێ هه‌مومان وا ده‌که‌ین کاتێك که‌سێك مه‌دحمان ده‌کات .. به‌ڵام پێت ده‌ڵێم خاکیبوونی دڵ زۆر جیاوازه له خاکیبوونی زمان ، له‌گه‌ڵم دای له‌مه‌دا ..!؟.

## تۆ له من باشتری و دایکیشت له دایکم باشتره ..!!

چه‌ند ناکۆکی‌یه‌ك له نێوان محمدی کوڕی حنیفیه‌و حسینی کوڕی علی ڕوی‌دا . ئه‌مانه دوو برا بوون له باوکه‌وه که ئه‌ویش علی بوو . دوای ئه‌وه ناکۆکی‌یه‌که درێژه‌ی کێشا ، محمدی کوڕی حنیفیه نامه‌یه‌کی نارد بۆ حسێن و تیایدا نوسی : براکه‌م ناکۆکیه‌که‌مان درێژه‌ی کێشا ، تۆ له‌من باشتری و دایکیشت له دایکم باشتره ، پێغه‌مبه‌ری خواش ده‌فه‌رموێ :

(چاکترینیان ئه‌وه‌یانه که ده‌ستپێشخه‌ری ده‌کات له ئاشته‌وایی دا ).

## ڕەوشتی باوەڕدار

دەترسم من دەستپێشخەربم ئەو وەختە لە تۆ باشتر بم ، توخوا تۆ دەستپێشخەر بە لە ئاشتی دا !!..

ئەمە چیە ...؟ سوێند بە خوا ئەم وتەیە لە خاکیەوە نەبێ دەرناچێ .. هەوڵبدە بتوانیت خاکی بیت و دامەزراو بیت ( هەر کەس بەدوای خێردا بگەڕێت دەستی دەکەوێت). کەواتە دەی بگەڕێ بە دوای خاکیبووندا لە هەموو ژیانتدا .

## دڵە خاکیەکان..

بفەرموو بۆ ئەم نمونەیەش:

زەیدی کوڕی سابت ڕۆژێك سوار وشترەکەی بوو عبداﷲەی کوڕی عەباس هات بۆ لای ، ڕشوەی وشترەکەی گرت و فەرمووی :

فەرمانمان پێ کراوە بەم شێوەیە بین لەگەڵ زاناکانمان .

زەیدیش بەپەلە دابەزی و دەستی عبدواللەی گرت و ماچی کرد و فەرمووی:

فەرمانمان پێ کراوە بەم شێوەیە بین لەگەڵ ئالوبەیتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ).

زەیدی کوڕی سابت کە قورئانی کۆکردەوە ، عبدالله کوڕی عەباس کە زانای ئوممەتە !! هونەر لە خاکیبووندا دەکەن بەڵام تۆ تاکو ئێستاش.... !! دەی .. ئەم وێنانە وەرگرە .. فێرببە چۆن خاکی بیت.

## هەر کەس خۆی ناسی خاکی دەبێت..

ئیمامی شافیعی دەفەرموێ : ئاوی زەمزەممان خواردەوە بە نیەتی زانست و زانستمان وەرگرت ، خۆ ئەگەر بە نیەتی لە خواترسان بمان خواردایە ئەوا بۆمان باشتر بوو .. دەزانی کێ ئەم قسەیەی کردوە ؟ .. ئیمامی شافیعی .. !!

یاالله .. شافعی ئەم قسەیە دەکات .. ئەی ئێمە چی بڵێین .. !؟.

بەڵێ هەرکەس خۆی ناسی خاکی دەبێت .

کاتی ئەوە نەهاتوە خۆت بناسیت ..!؟.

سەیری خاکیبوونی ئیمامی شافیعی بکە .. دەڵێت :

احب الصالحين ولست منهم　　لعلي ان انال بهم شفاعة

و اكره من تجارته المعاصي　　وان كنا سواء في البضاعة

چاکەکارانم خۆشدەوێ گەرچی لەوانیش نیم

بەڵکو لەوان تکایەکم دەست کەوێ

کەسێکم خۆش ناوێ کاسپی گوناهەکا

گەرچی کۆڵی هەردولامان یەککەوێ

بەلاتەوە سەیر نەبێت .. ئەو خۆی ناسیبوو .. ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە تۆش خۆت بناسی ؟

# ڕێگە بەرەو خاکی بوون

## خاکیبوون لە بەرگ و پۆشاکدا..

بفەرموو بۆ چەند نمونەیەکی خاکیبوون لە ژیانماندا .. وەسەرەتاش بە خاکیبوون لە بەرگ وپۆشاکدا دەست پیٚ دەکەین ..

پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)وتی : ئەی پێغەمبەری خوا من حەز دەکەم بەرگ و پۆشاك و نەعلەکانم چاك بن ئایا ئەمە هیچ خۆ بە گەورە زانینێکی تیایە ؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی :

( نەخێر ، خوا جوانەو جوانیشی خۆش دەوێت ). موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

هەندێك هەن وادەزانن خاکیبوون لە بەرگ و پۆشاکدا ئەوەیە کە خراپترین پۆشاك لەبەر بکەیت!!.

ئاممان نەکەی ئەو وێنەیە بدەی بە خەڵکی کە:

(دینداره‌کان خەڵکانێکن زەوق و سەلیقەیان نیە لە جل وبەرگدا) .

باشترین پۆشاك لەبەربکە وە جوانترین پۆشاك لەبەربکە ، بێگومان تۆ دەبێت وابیت ، بۆ خۆبەگەورەزانی و فەخر نا بەڵکو بۆ ئەوەی کە خەڵك بڵیٚ دیندارەکان باشترین و جوانترین پۆشاك دەپۆشن .

## نەکەی شتیوا بکەی ..!!

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ :

﴿ بينما رجل يتبختر في برويه اذ خسف الله به الأرض فهو يتجلجل فيها الى يوم القيامة﴾. موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

**واته: لەکاتێکدا پیاوێك خۆی بەزل دەگرت لەناو پۆشاکەکانیدا، لەپڕ خوای گەورە بەناو زەویدا بردیە خوارەوە ، تاقیامەت لەناویدا دێت ودەچێت .**

**ئەمە پەیامێکە بۆ کچان ، خاکیبە لە پۆشاکدا ، نەکەی ......**

**وەهەروەها بۆ کوڕان ، ناترسن خوای گەورە زەوی ژێر پێتان ببات بە ناخدا ..... ؟!**

**خاکی بن و بیرتان بێت:**

**هەرکەس لەبەر خوا خاکی بێت خوا بەرزی دەکاتەوە ..**

## خاکیبوون لەگەڵ خزمەتگوزاردا..

**پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ :**

﴿ إخوانكم جعلهم الله تحت أيديكم. فأطعموهم مما تطعمون . وألبسوهم مما تلبسون . ولكلفوهم بما يطيقون . فأن كلفتموهم بما لايطيقون فأعينوهم ﴾.

بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: براکانتان خوای گەورە لەژێر دەستی ئێوە دایناون،لەوەی خۆتان دەیخۆن نۆشی ئەوانیشی بکەن ـ لەوەش خۆتان دەیپۆش بەبەرگی ئەوانیشی بکەن، ئەوەندەیان بدەن بەسەردا کە بیتوانن، گەر داوای زیاترتان لێکردن ئەوا خۆشتان هاوکاریان بن و یارمەتییان بدەن.**

**هەروەها دەفەرموێ (ﷺ):**

﴿ إذا أتى احدكم خادمه لطعام فليجلسه معه . فأن لم يجلسه معه فليطعمهُ اللقمة و اللقمتين ، والأكلة والأكلتين ﴾. ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

واتە: ئەگەر خزمەتکارێکتان هات بۆ خوادن، با لەلای خۆی دایبنیشێنی، گەر لای خۆیی داینەنیشاند با پاروێك یادوپاروی بداتێ یاخو بابۆڵەیك یا دوبابۆڵەی بداتێ .

گوێم لێتانە دەڵێن: ئاخر ئەمە زۆر قورسە .. ئایا ئەم وشەیە:

﴿إخوانكم﴾ دڵی نەرم نەکردیت .. دەترسم وا گومانتان بردبێت کە ئەوان بەندەی ئێوەن؟.

ئافرەت دێت بە خزمەتگوزارەکەی دەڵێت: دەمەوێت ماڵەکە لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی پاك بکەیتەوە..!!. خزمەتگوزار ماندوو دەبێت بەم کارە پاشان کاری تریشی بەسەردا دەدات کە توانای ئەنجامدانی نیە.

خۆ ئافرەتانێکیش هەن کە تەنها یەك هەڵە لە خزمەتگوزارەکانیان قبوڵ ناکەن و تورە دەبن و بەسەریاندا دەقیژێنن ... توخوا .. ئەوان براتانن خوا خستونیەتە بەر دەستی ئێوە ..

خاکی بن لە گەڵ خزمەتگوزارەکانتاندا ..

## خاکیبوون لە دروستکردنی ماڵدا ..

علی کوڕی ئەبوتالب دەفەرموێ :

ئەو ڕۆژەی کە فاتیمەم هێنا ماڵەکەمان تەنها پێستەی بەرانێکی تیا بوو لەسەر زەوی دامانخستبوو لەگەڵ یەك لێفەدا ..

من ئەمە ناڵێم بۆ پێوانەکردن و بەراورد کردن .. وە بۆ ئەوەش نایڵێم کە خۆتان نارەحەت بکەن ، بەڵکو ئەمە دەڵێم تاکو زیادەڕەوی نەکەین لە داواکاریەکانمان .. پرۆسەی هاوسەرگیری هەبووە کە سەری نەگرتووە لەبەر ئەوەی بە خێزانەکانی تر پێوانە کراوە .. تکات لێ

دەکەم .. قسە بەسەرزارەکی وەر مەگرە و لە ماناکەی تێ بگە ....
ماڵەکەت بەو شێوەیە دروست بکە کە خۆت پێت خۆشە ، بەڵام
زیادەڕەوی مەکە ... خاکی بە لە دروست کردنی دا ئەگەر دەکرێ .

## خاکیبوون لەگەڵ نزیکان بەتایبەت ...!!

لەگەڵ کەسوکار و نزیکەکانتدا بە تایبەت هەژارەکانیان خاکیبە ...
ئێستە بیربکەرەوە..چاکەیان لەگەڵدا بکە..هەواڵیان بپرسە..سەردانیان
بکەو یارمەتیان بدە.
نەکەی تەنها لەگەڵ نزیکە دەوڵەمەندەکانتدا چاك بیت.
ئایا لەخوا ناترسیت؟
ئایا واز لەسەردانی کەسەکانت دەهێنیت لەبەر ئەوەی هەژارن؟ کوا ئەو
ڕەوشتە جوانەی کە فێری بوی ؟.

## خاکیبوون لەگەڵ کەسانی خوارتر لە ئاستی کۆمەڵایەتی وڕۆشنبیری تۆ..

خاکیبوون بۆ ئەوانەی لە تۆ خوارترن ، بە چاوی کەمی و بچوك سەیری
کەس مەکە ... نەکەی ڕۆژێك لە ڕۆژان بڵێی من کوڕی فلانی فلانم ...بە
زانستت لە خۆت بایی مەبە و خاکیبە لە بەر خوا گەرنا ..........

## خاکیبوون لەگەڵ ئەوانەی کە فێرت دەکەن..

## ڕەوشتی باوەڕدار

خاکیبە لەگەڵ مامۆستاکەت ، ئامماں نەکەی گاڵتەی پێ بکەی .. لە منداڵانی خەلیفەکانەوە فێری خاکیبوون ببە کە پێڵاوی مامۆستاکانیان هەڵدەگرت ، گوێم لێتە دەڵێی تۆ مامۆستاکەمان ناناسی..

ئەی برای خۆشەویستم .. تۆ لەبەر خوا خاکیبە و لەبەر خوا مامەڵە بکە لەبەر ئەوە با نیەتت ڕاستگۆیانە بێت.

## خاکیبوون لەگەڵ ئەوانەی کە فێریان دەکەی..

بەتایبەت لێرەدا مەبەستمان لە زانست : بانگەوازە بۆ لای خوا .. ئەی ئەوانەی کە بانگی خەڵکی دەکەن بۆ لای خوا خاکی بن ، ئەی خاکی پێمەکەنو گاڵتەمەکە بە کەسێك کە هەڵەیەك دەکات ..پاش ماوەیەك پەشیمان دەبێتەوە .. تۆ بەو ڕێگەیە وا لەخەڵکی دەکەیت کە ڕقیان لە دین بێت .. خاکیبە خوا هیدایەتت بدا و لێت خۆش بێت..

**سوێند بە خوا بە خاکیبوونت دین لای خەڵکی خۆشەویست دەکەیت .**

## خاکیبوون لەگەڵ دایك و باوك دا ..

**خوای گەورە دەفەرموێ :**

﴿ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ ﴾ الاسراء: ٢٤

**واتە: باڵی میهرەبانی خۆتیان بۆ ڕاخە و ملکەچ بە بۆیان .**

ئەگەر زیندوو بوون ... خۆ ئەگەر وەفاتیان کردبوو داوای لێ خۆشبونیان بۆ بکە ، کاری چاکە بکە دەچێتە تەرازوی ئەوانەوە ، هەروەها لەگەڵ هاوڕێکانیاندا باش بە ..

**وانەیەکی کرداری :**

**دەڵێیت دەمەوێت بە کرداری خاکی بم لەگەڵ دایك و باوکمدا ، بەڵام نازانم چۆن .. ئەی خۆشەویستم داوات لێ دەکەم دەستی دایك و باوکت ماچ بکەیت ..**

**ئایا دەتوانی لەبەر چاوی خەڵك وخزم و کەسوکاردا دەستی دایك و باوکت ماچ بکەیت ؟**

**گەر دەتەوێت خاکیبوون فێرببیت دەستی دایك و باوکت ماچ بکە بۆ ماوەی مانگێك وەك تاقیکردنەوە ... ئەو کات دەبینی گۆڕاوی ...**

**گوێم لێتە دەڵێی : دەتوانم دەستی دایکم ماچ بکەم بەڵام باوکم نا ناتوانم!!.**

**منیش پێت دەڵێم : کەواتە لە باوکتەوە دەست پێ بکە ، ڕاستە کارەکە گرانە بەڵام دەزانم کە ئەوە مەبەستە لە خاکیبون دا .**

## منەتی زۆری چاکەکانت مەکە ...

**جوانترین خاکیبوون ئەوەیە کە ملکەچ وخاکی بیت لەبەردەم خوای گەورەدا ، نەکەی بە نوێژەکانت منەت بکەی .. یان بە شەونوێژ .. یان بە ڕۆژووەکانت ... یان بە باڵاپۆشیەکەت ... بزانە کە:**

﴿ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ﴾ النساء: ١١٣

**واتە: بەردەوام فەزڵ و ڕێزی خوا لەسەر تۆ زۆر فراوان و ئاشکراو دیارە.**

**لەبەردەم خوای گەورەدا خاکی بە ، نەکەی منەت بکەی بەسەر خوادا، چونکە لەو کارەدا فەوتان و تیاچون هەیە ..**

## بەڵام ... چۆن خۆمان بە ڕەوشتی خاکیبوون بڕازێنینەوە .!؟.

چی بکەم بۆئەوەی خاکی بم ..؟.

چی بکەم بۆئەوەی خاکیبوون ببێتە ڕەوشتێکی چەسپاو لای من..؟.

ئەمە دەست پێشخەریەکی باشە لە تۆوە..

چونکە ئیستا تۆ تەنها ناخوێنیتەوە و بەس بەڵکو دەخوێنیتەوە بۆ ئەوەی تیٚ بگەیت و پاشان کاری پیٚ بکەیت و پاشان خەڵك فێر بکەیت.. ...

گومانم لە بەرامبەرت لەجێی خۆیدا بوو ... وە وا دەزانم زۆر باشیت و دڵم پێت خۆشە ..

### یەکەم : خوای خۆت بناسە..

لەو هۆکارانەی کە یارمەتیدەرتە بۆ خاکیبوون ئەوەیە کە خوای خۆت بناسیت و گەورەیی خوا ببینیت لە دروستکراوەکانیدا ، بزانیت کە خوای تۆ بەتوانایە .. وە نیعمەتەکانی لەژمارە نایەن .. وە هەست بە دەوڵەمەندی ئەو زاتەو هەژاری خۆت بکەیت .. وە بەهێز و توانای ئەو زاتەو لاوازی تۆ ... وە بە گەورەیی ئەو زاتەو زەلیلی تۆ ..

ئەو کاتە دەزانیت تۆ کێیت ..؟ کەواتە خاکیبە بەرامبەر جێبەجێکاری کارەکان و دروستکاری ئاسمانەکان و زەوی ..

### دووەم : ڕاهێنانی کرداری..

پاش ئەوەی خوای خۆتت ناسی .. دەی ئەوەی خوێندوتەتەوە بە کرداری جێبەجێی بکە ، ئاممان نەکەی تەنها بۆ خۆشی خوێندبێتتەوە .. بەڵکو با خوێندنەوەکەت بۆ تێگەیشتن و کارپێکردن بێت .

ئێستە:

دەست پێبکەو سەرەتاش لەگەڵ فەرمانبەرە سادەکان دابنیشەو نانیان لەگەڵدا بخۆ ، جارێکیش لەگەڵ خزمەتگوزارەکەت ،ماڵەکەت پاك بکەرەوە ، قاپەکان بشۆو بڵێ: (من ئەمڕۆ بەرپرسیارم لەکارەکانی ماڵەوە). دەستی دایك وباوکت ماچ بکە ، سەردانی خزمە هەژارەکانت بکە، هەواڵیان بپرسە ، گاڵتە بەهیچ کەسێك مەکە هەرچۆنێکە ، تەنها ڕۆژێك سواری هێڵە گشتیەکانی گەیاندن ببە و سەیارەکەی خۆت لەماڵەوە جێ بهێڵە .. جانتای قورسی دراوسێکەت هەڵگرەو یارمەتی بدە بۆگەیاندنی بۆماڵەوە ، بەوانە دڵخۆش مەبە کە مەدحت دەکەن ،تورەش مەبە بەوانەی کە خراپەت لەگەڵدا دەکەن ، خۆش مامەڵەبە لەگەڵ ئەوانەی کە لەلایەنی کۆمەڵایەتیدا لەتۆ خوارترن ، سڵاو لەدەرگەوانی باڵەخانەکان بکەو هەواڵی تەندروستی و دەنگ و باسی منداڵەکانیان بپرسە...هتد

بەکورتی :

باشترین ڕێگا بۆئەوەی خاکیبوون بکاتە ڕەوشتێکی چەسپاو تیاتدا ، ئەوەیە کە:

## ڕەوشتی باوەڕدار

(بگەڕێیت بەدوای ئەو شتانەی کەلەسەرت قورسن .. ئەوەی بەخۆت ڕەوا نابینیت ئەنجامی بدەیت .. ئەوکاتە خاکیبوون بۆت دەبێتە ئاو و هەوا و ناتوانی بەبێ ئەو بژیت ..).

## چۆن بزانیت کە تۆ بویتە کەسێکی خاکی؟

گەر دەتەوێ بزانی ئایا بویتە کەسێکی خاکی یان نا ؟

ئەوا ئەم هۆکارە کرداریە بەکاربهێنە :

لەیەکێك لە هاوڕێکانت یان دراوسێکانت یان منداڵەکانت یان نزیکەکانت یان خزمەتگوزارەکەت یان دایکت یان باوکت یان هەرکەسێکی تر گرنگ ئەوەیە تۆ متمانەت پێی هەبێت بپرسە : ( چی دەڵێی بەرامبەرم ).

ئەوکاتە دەزانیت کە ئایا تۆ خاکیت یان جارێ ماوتە ، باشیش بزانە کە خەڵکە سادەکان موجامەلەت ناکەن ...

## یادیان بخەرەوە چونکە یادخستنەوە سود بە ئیمانداران دەگەیەنێت..

دڵەکانتان بکەنەوە ... نیەتەکانتان نوێ بکەنەوە ... ئەم دیاریە لە من وەرگرن :

( پێغەمبەر (ﷺ) زۆر خاکی بووە ، دوور بوە لە خۆبەگەورەزانی ، نەیهێشتوە خەڵك لەبەری هەستێت ، سەردانی هەژارانی کردووە و لە گەڵیاندا دانیشتووە ، وەکو یەکێك لە هاوەڵان لە ناویاندا دادەنیشت ، نەعلەکانی خۆی چاك دەکرد و جلوبەرگی خۆی دەدورییەوە ، بە

دەستی خۆی کاری دەکرد ، مرۆڤێك بووە لە مرۆڤەکان ، حەیوانی دۆشیوە ، خزمەتی خۆی کردووە ، نەیهێشتوە کەس لەدوایەوە بڕوات ، نە لە خۆراك و نە لەپۆشاکدا لە خەڵکی تر جیاواز نەبووە ، خزمەتی ئەوەی کردووە کە خزمەتی کردووە . هەرگیز قسەیەکی بە بەردەستەکانی نەوتوە و ڕەخنەی لێ نەگرتوون لە بەرامبەر کارەکانیان ... هتد) .

## ئەگەر دیاریەکەم ڕەت ناکەیتەوە ئەوا..

(خاکی بە) ئەمە دیاری منە ....

وە لە یادت بێت :

﴿ لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من الكبر ﴾.

واتە: ناچێتە بەهەشتەوە ئەوەی کە بەهێندەی مسقاڵە زەرەیەك خۆبەزلزانی تێدا بێت .

## خوایە..

خوایە خاکیبوونمان پێ ببەخشە.

خوایە خاکیبوونمان لە لا خۆشەویست بکە.

خوایە پەنات پێ دەگرین لە خۆبەگەورەزانی ...

خوایە خۆبەگەورەزانیمان لەلا ناشرین و بێزراو بکە.

خوایە یارمەتی و کۆمەکامان بکە لە سەر زکرو یاد و سوپاسگوزاری و چاکپەرستی زاتی گەورەت ...

ئامین..

## ڕاستگۆیی

### ڕەوشتی پێغەمبەران..

**ڕاستگۆیی یەکێکە لەو خەسڵەتانەی کە وابەستەی پێغەمبەران بووە (سەلامی خوایان لەسەر بێت ).**

**نابێت و نەگونجاوە کە یەکێك لە پێغەمبەران تەنها درۆیەك لە ژیانیدا هەبوبێ ، وە هەر کاتێك خوای گەورە مەدحی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران بکات بە ڕاستگۆ وەسفی دەکات وەك دەفەرموێ :**

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴾ مريم: ٤١

**واتە: هەروەها لەقورئاندا باسی ئیبراهیم بکە ، بەراستی ئەو پێغەمبەرێکی راستگۆ بوو .**

**هەروەها دەفەرموێت :**

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴾ مريم: ٥٦.

**واتە: هەروەها لە قورئاندا باسی ئیدریس بکە چونکە ئەویش پێغەمبەرێکی زۆر راستکارو راستگۆ بوو .**

**وە هەروەها دەفەرموێ :**

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيًّا ﴾ مريم: ٥٤

**واتە: ئیسماعیلیش باس بکە لە قورئاندا ، بەڕاستی ئەو لەبەڵێن و پەیمانەکانیدا راستگۆ بوو ئەو پێغەمبەر و رەوانەکراوی خوا بوو.**

بينيت ... كە ڕاستگۆیی خەسڵەتێکی چەسپاوی پێغەمبەران بووە؟ پێویست بووە وابن تاکو بۆ تەنها سات و جارێك کەسێك گومانێکی لا دروست نەبێت بەرامبەریان .

## ڕاستگۆی دەست پاك..

گەر خەسڵەتێك هەبێت کە پێویست بێت خۆشەویستمانی پێ بناسرێت پێش پێغەمبەرێتی دەبێ ڕاستگۆیی بێت ، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ لە پێش پێغەمبەرێتی بە ( ڕاستگۆی دەست پاك ) ناسرابوو .

سبحان الله.. چل ساڵ پێش پێغەمبەرێتی بە ڕاستگۆی دەست پاك ناسراوە ﴿ﷺ﴾ : فێر ببە لە خۆشەویستەکەتەوە .

## هیچ کات درۆمان لێ نەبیستویت..

بە سێ ساڵ پاش بونی بە پێغەمبەر خوای گەورە داوای لێ کرد کە بانگەوازەکەی ئاشکرا بکات .

﴿ فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ ﴾ الحجر: ٩٤

واتە: هەر فەرمانێکت پێدراوە بەرێك و پێکی ئەنجامی بدە و گوێ مەدە بە بوختان و ڕەفتاری موشریك و هاوەڵگەران.

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾چوە سەر کێوی سەفا و بانگی کرد:( ئەی نەوەی فلان ئەی نەوی فلان،) بۆ ئەوەی هۆزەکان کۆبنەوە ... هەمویان هاتن بەجۆرێك کە تەنانەت ئەوەی نەیدەتوانی خۆی بڕوات کەسێکی لە بری

خۆی دەنارد ، کاتێ: کۆبونەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( ئەگەر پێتان بڵێم لەودیوی ئەم شاخەوە چەند سوارێك هەیەو دەیەوێ بدات بە سەرتاندا باوەڕم پێ دەکەن)؟ وتیان: بەڵێ جگە لە ڕاستی هیچمان لێ نەبینیوی، ئینجا فەرمووی:(من ئاگادارکەرەوەی خوام بۆ ئێوە وە ئاگادارتان دەکەمەوە لە سزایەکی توند).

ئەبولەهەب هاواری کرد : دەستت بە قوڕدا چێت بۆ ئەمە ئێمەت کۆ کردوّتەوە ؟ .

یاالله .... پێغەمبەری خوا حوججەیان لەسەر دەکات ، پێشتر شتێکی پێ ووتن زۆر نزیك بوو لەوەی کە بەڵێی بۆ نەکەن و باوەڕی پێ نەکەن چونکە کێوی سەفا بچوکە و کورتە لەگەڵ ئەوەشدا فەرمووی:

( چی دەڵێن؟).

ئەوانیش بەبێ پەردە ووتیان:

( جگە لە ڕاستی هیچی ترمان لێ نەدیویت)!!.

تەنانەت لە دوای ئاشکراکردنی بانگەوازەکەش ئەبولەهەب نەیتوانی بە درۆی بخاتەوە بەڵکو تەنها ئەو قسە نابەجێیەی ووت .

## کێ هەیە گوفتاری لە فەرمایشتی خوا ڕاستر و دروست تر بێت؟..

سەیرکە خوا چۆن مامەڵەمان لەگەڵدا دەکات ... دەفەرموێت:

﴿ اَللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴾ النساء: ٨٧

واته: (اللّه) خوایەکە بێجگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە سوێند بەخوا لەرۆژی قیامەتدا کۆتاندەکاتەوە و هیچ شکو گومانێکی تێدا نیە جا کێ هەیە قسەو گوفتاری لە فەرمایش و فەرمودەی خوا راستر و دروستتر بێت ؟.

پاش ئەوەی ئەم ئایەتە لەقولایی دەرونتدا چەسپی ...وە کاریگەری لەسەرت هەبوو ، ئایا باوەڕ بەڕۆژی دوایی دەکەیت ..!؟

دەڵێیت : بێ گومان باوەڕی پێ دەکەم ... کەواتە چیت بۆ ئامادە کردوە!؟

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا ﴾ النساء: ١٢٢

واته: ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە ، ئەوە لەمەودوا دەیانخەینە ناو باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها روبار بەژێر درەخت و بەبەردەم کۆشکەکانیاندا دەڕوات و ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە و بەردەوام تیایدا دەبەنە سەر ، ئەوە بەڵێنی نەگۆڕاوی خوایە ، جا کێ هەیە راستتر و دروستتر لەخوا بەڵێنی خۆی بباتە سەر ؟.

کەسێك هەیە ڕاستگۆتر بێت لە خوا ... !؟

گەر دەزانی بەهەشتێك هەیە ،کوا خۆ ئامادەکردن بۆی ؟

گەر دەزانی ئاگرێك هەیە ، ئەی کوا ترس لێی...؟

گەر دەزانی ڕۆژی دوایی هەیە ، کوا ئامادەسازی ڕۆژی دواییت ؟

خوا بە درۆ دەخەیتەوە .....!؟

حاشا خوایە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەین ... سوێند بەخوا ئەم واتایانە زۆر بەرزن بەڵام گەر بگەن بە دڵانێکی زیندوو ...

## پاکو بێگەردی بۆ خوا .!! شتێکی زۆر سەیرە !!

چەند مانایەکی ئیسلامی جوان هەیە کە لە ڕاستگۆیی‌یەوە سەرچاوەیان گرتووە ، بەڵام ئێمە ئاوڕیان لێ نادەینەوە بۆ نمونە:

( صدیـق ) لەووشەی ( صدق )وە هاتووە بەومانایەی کە: ئەو ڕاستگۆیە لە مامەڵەکردنی لەگەڵتدا و خیانەتت لێ ناکات .

هەروەها ووشەیەکی تر کە زۆر بە دووری دەزانین و وانازانین کە لە ڕیشەی ووشەی ( صدق ) بێت . ئەزانن چیە ؟

( صدقە ) بەخشین ... ئەمە چۆن، ... ؟ لە بەرئەوەی ( صدقە ) بەخشین بەڵگەی ڕاستگۆیی تۆیە لەگەڵ خوادا ..

خوات خۆش دەوێ؟ بە کرداری بەڵگەی ئەو ڕاستگۆی‌یەم بەرێ... ببەخشە.

ئەگەر ئەم مانا جوانە ( صدیق + صدقە ) لە ڕاستگۆییەوە سەرچاوەیان گرتبێت ئەی دەبێ ڕاستگۆیی خۆی چۆن بێت ؟.

## ئاسانە ... !

ڕەوشتی ڕاستگۆیی هەوڵ و توانای زۆری دەوێ بەڵام ئاسانە بۆ کەسانێك کە دەیانەوێت ، کەواتە هەر لە ئێستەوە نیەتی ڕاستگۆیی بێنە و بەردەوام بە لەسەری بە درێژایی ژیانت ، چونکە ئەم ڕەوشتە دەکرێ جێبەجێ بکرێت گەر ئێمە خۆمان بمانەوێت ..

تکات لێ دەکەم .. پاش ئەوەی ئەم چەند دێڕەت خوێندەوە گۆڕانکاری لە ژیانتدا بکە و هەرگیز درۆ مەکە ... خواش یارمەتی دەرتە .

## جا له دوای بەهەشت داوایەکی تر هەیە ... !؟

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

《 ان الصدق یهدی الی البر . و ان البر یهدی الی الجنة ، و ان الرجل لیصدق . و یتحری الصدق حتی یکتب عند الله صدیقا ، و ان الکذب یهدی الی الفجور وان الفجور یهدی الی النار . و ان الرجل لیکذب ، حتی یکتب عند الله کذابا 》 بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: ڕاستگۆیی بەرەو چاکەکاری ڕێنومایی دەکات ، چاکەکاری بەرەو بەهەشت ڕێنومایی دەکات ، کەس هەیە ئەوەندە ڕاستگۆیە و بەدوی ڕاستیەکاندا دەڕوات ، تا لای خوای گەورە بەڕاستگۆ تۆمار دەکرێت، درۆزنیش بۆ تاوانباری ڕێنومایی دەکات، تاوانباریش بەرەو لای دۆزەخ ڕێنومایی دەکات، کەس هەیە ئەوەندە درۆ دەکات تالای خوای گەورە بەدرۆزن تۆمار دەکرێت .**

**بەڵێ..هەر کەس ڕوناکی پاداشتی بۆدەرکەوت ، تاریکی داواکراوی لەسەر دەڕەوێتەوە ، پاداشتەکەش چیە ؟ (بەهەشت ) داوا کراویش (ڕاستگۆییە ) زۆر سوك و ئاسانە لەبەرامبەر ئەو پاداشتە گەورەیەوە .**

## پێت خۆشە بەچی بنوسرێیت لای خوا !؟

**بیر بکەرەوە لەوەی کەتۆ لای خوا بەدرۆزن نوسرابیت ... !! لەڕۆژی دواییدا بچیتە بەردەمی خواو ئەوە خەسڵەتت بێت ( درۆزنی ) ! ، پەڕەکانی نامەی کردەوەکانت هەڵدەدرێتەوە لەهەمووی نوسراوە (درۆزن) فریشتەکانیش بەدرۆزن بانگت دەکەن و دەتناسنەوە .**

**دەتبینم پەنا دەگری بەخوا ... مژدەت لێ بێ دڵت زیندوە ..**

**وەهەروەها بیر لە پێچەوانەی ئەمەش بکەرەوە ، تۆ ڕاستگۆبوی لەگوفتارو کردارتدا؟ وەلای خوا بەڕاستگۆ نوسراوی ، ئەو کاتە**

## ڕەوشتی باوەڕدار

ناونیشانی نامەی کردوەکانت ( ڕاستگۆییە ) وەڵامی فریشتەکانیش ڕاستگۆییە .

گوێم لێیە دەڵێی : خوایە ئامین .. من لەوانەم ..

گەر ئەمەت دەوێ لەئێستەوە ، دەست پێبکەو بڵێ لەئەمڕۆوە من درۆ ناکەم .. هەرچۆنێك بێت .

## بۆچی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەم وشەیەی هەڵبژاردووە .؟

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەوفەرمودەیەدا کەپێشتر ئامارەمان پێکرد .. ووشەی (یهدی ) هەڵبژاردوە .. پاکو بێگەردی بۆخوا وەك بڵێی ڕاستگۆیی دەستت دەگرێت بەرەو بەهەشت و درۆش دەسستت دەگرێ بەڵام بۆ دۆزەخ هەروەها پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ووشەی ( فجور )ی هەڵبژاردوە لەبەر ئەوەی ناوێکی کۆیە بۆ هەموجۆرە خراپەو شەڕەکان .

یالله. !! هەمو خراپەو شەڕەکان لەدرۆوە سەرچاوە دەگرن .. ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە کە ڕاستگۆبین !؟.

## بەهەشت چۆن زەمانەت دەکرێت .. ؟!

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت:

﴿ إضمنوا لي ستا من انفسكم اضمن لكم الجنة : اصدقوا اذا حدثتم . واوفوا اذا عاهدتم واودوا اذا ائتمنتم . واحفظوا فروجكم . واغضوا ابصاركم . وكفوا ايديكم ﴾.

ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

واتە: بنە کەفیلی شەش شت لەخۆتاندا من کەفیلی چونە بەهەشتان بۆ دەکەم:ڕاستگۆبن لەئاخاوتندا، بەوەفابن لەپەیمانەکانتاندا، داوێنتان بپارێزن، چاوەکانتان دابخەن (لەئاستی نامەحرەمدا) دەست درێژی مەکەن.

ناگونجێ دوای خوێندنەوەی ئەو فەرمودەیە شتێك لەدڵتدا دروست نەبێت دەڵێیت :ئەوەی مەبەستە ڕویدا منیش پێت دەڵێم داوایەکت لێ دەکەم بۆ ئەوەی کە ئەوەی ئێستا لەدڵتدا دروست بووە بە درێژایی ژیانت بمێنێتەوە ئەم فەرمودەیە بەخەتێکی جوان بنوسەرەوە لە شوێنێکی ژورەکەتدا هەڵی بواسە کە بەردەوام ببیبینیت و لەبەری بکەیت و جێبەجێی بکەیت.

## خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە

## ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)..

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ**

﴿ من يضمن لي ما بين لحييه و ما بين رجليه أضمن له الجنة ﴾

بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

واتە: هەرکەسێك زەمانەتی نێوان دوشەویلکەو نێوان دوقاچیم بۆبکات (واتە زمان وعەورەت) ئەوا زەمانەتی چونە بەهەشتی دەکەم .

دیارە مەبەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە یەکەمیان زمانەوە و دوەمیشیان دامەنە..

پاکو بێگەردی بۆ خوا !! ئەم دوانە زەمانەت بکە بەهەشتت دەست دەکەوێت ئایا وادەکەی یان .........!؟.

## گەنجینەیەکی وون ... !!

**پیغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿ إنَّ الصدقَ طمأنينه والكذبَ ريبة ﴾. ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: ڕاسگۆیی هێمنی و ئاشتەوایی دەروونە، درۆکردنیش دڵەڕاوکێیە .**

تۆکاتێك ڕاستگۆ دەبی هەست بە ئارامی دەکەی .. هەست بە ئاسودەیی دەکەی ، وانیە ؟ لەگەڵ ئەوەشدا کەتۆ دەزانیت زۆر جار ڕاستگۆیی توشی ناڕەحەتیت دەکات . بەڵام هەست بە دڵەڕاوکێ و دوو دڵی ناکەیت.

وادانێ ئێمە ئێستە گفتوگۆیەك ئەنجام دەدەین کەلەوپەڕی هێمنی و ئارامی دایە ... پێغەمبەر (ﷺ) باس لە ناوەڕۆکی دەرونی مرۆڤ دەکات ، ڕاستگۆیی بە ئارامی لە قەڵەم دەدات ، ئارامیش ئەو گەنجینەیەیە کە وون بوەو ئێستە خەڵکی بە دوایدا دەگەڕێن ... هەروەها درۆ بە دوودڵی و گومان.

ئێمە لەو ساتانەی کە بەئارامیەوە باسی ڕاستگۆیمان دەکرد هەستمان دەکرد سۆز و ئیمان دڵی داپۆشیوین ، بەڵام کاتێك باسی گومان و دوودڵی دەکەین ئەو کەشە گۆڕا ، ئەی چی دەڵێی بەرامبەر ئەوانەی کە چەندین ساڵ بە درۆ بە سەر دەبەن ...؟.

## کامیان باشترە و بۆچی ؟

دەتوانین بە جۆرێکی تر لەم فەرمودەیە تێ بگەین ، ئێمە کاتێك مامەڵە لەگەڵ ڕاستگۆدا دەکەین هەست بە ئارامی دەکەین ، وە کاتێك مامەڵە لەگەڵ درۆزندا دەکەین هەست بە گومان و دوو دڵی و ترس دەکەین .

لەگەڵمدا بهێنە پێش چاوی خۆت .. گەر کۆمەڵگە گومان و دوو دڵی باڵی بەسەردا بکێشێت ، دەبێت ئەم کۆمەڵگەیە چۆن بێت و چۆن خەڵك تیایدا بژی ؟.

وە بیربکەرەوە ... گەر کۆمەڵگە ڕاستگۆیی و ڕەحمەت و ئارامی باڵی بەسەردا بکێشێت ، تا چ پلەیەك متمانەی تیادا دەبێت ؟.

تۆ کام لەم دوو کۆمەڵگەیە هەڵدەبژێریت ..؟

لە خۆتەوە دەست پێ بکە تا چواردەوریشت باش ببێت.

## خیانەتێکی گەورە..

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:

﴿ كبرت خيانة أن تحدث أخاك حديثا هولك به مصدق و أنت له به كاذب .. ﴾

ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: گەورەترین خیانەت قسەکردنە لەگەڵ براکەتدا بەدرۆزنی لەکاتێکدا ئەو بەدڵی پاکەوە بەڕاستگۆت بزانێ .**

**مەعقولە !!**

گەورەترین خیانەت ئەوەیە کە تۆ قسەیەکی درۆ بۆ هاوڕێکەت بکەیت و ئەو بەڕاستی بزانێت و تۆش گاڵتەی پێ بکەیت...!! و بڵێیت : بینیتان چۆن پێی پێکەنیم ئەو زۆر ... ساویلکەیە!! .

**ئامان برای خۆشەویستم:**

نەکەی بکەویتە ئەو حاڵەتەوە ... ئەمە فەرمودەیەکە پێویستی بە دڵە کراوەکانە.. ئەوانەی پێش قسەکردن تێ دەگەن .. ئەی چی دەڵێی گەر وشەی(گەورەترین خیانەت ) ببینیت !!.

وە هیچ دڵگرانیش مەبە لەوەی جارێك لە جاران تۆ ساویلکە بویت و ئەو خیانەتکار!!.

## دوو ڕوو !! ئایا ئەمە مەعقولە !؟

پێغەمبەر «ﷺ» دەفەرموێ:

﴿آية المنافق ثلاث : إذا حدث كذب وإذا وعد أخلف ، و إذا ائتمن خان ﴾.

بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

واتە: نیشانەی دوڕویی سیانە: کاتێك قسەی کرد درۆ دەکات، گەر پەیمانیدا دەیشکێنێ، گەر ئەمانەتی لادانرا خیانەتی لێدەکات.

وەك بڵێی سەیری بریسکەی چاوەکانت دەکەم کاتێك دەڕوانیتە ووشەی ( منافق ) وە وا دەزانی یەکەم جارتە دەیخوێنیتەوە ... بمبەخشە ، بەڵام ئایا لە گەڵمدانیت کە لەشساغی تاجێکە لەسەر سەری لەش ساغان تەنها نەخۆشەکان دەیبینن؟.

## باوەڕم پێ دەکەی گەر پێت بڵێم : لە ئەمڕۆوە درۆ ناکەیت !؟

سوێندت دەدەم بە خوا .. چەند دەتوانی لەم فەرمودەیە ورد ببەرەوە ، بەڵام بە هەموو توانات ..

پێغەمبەر «ﷺ» دەفەرموێ :

﴿إذا كذب العبد تباعد عنه الملك الموكل به ميلاً من نتن ما جاء به ﴾.

ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

واتە: گەر کەسێك درۆیکرد ئەوا فریشتەی هاودەمی تایبەتکراوی، میلێك لێی دور دەکەوێتەوە لەتاو بۆگەنی ئەو درۆیەی کردویەتی .

یاالله !!

فریشتە میلیك دور دەكەوێتەوە لە بۆگەنی درۆیەك !!
ئەی دەبێ چۆن خوای گەورە لێت تورە بێت ؟ ئەی ئەگەر فریشتە میلێك لێت دورکەوێتەوە کێ لێت نزیك دەبێتەوە ؟ شەیتان ، بۆیە ئاگادار بە لە درۆ ، چونکە چاکە چاکە بە دوای خۆیدا دەهێنێ و خراپەش خراپە بەدوای خۆیدا دەهێنێ .

## دڵی پێغەمبەری خوا بەرامبەرت گۆڕاوە .. بەڵام فرسەتێکت لە بەردەمدایە !!

هاوەڵان دەفەرمون ڕەزای خوایان لێ بێت : هیچ ڕەوشتێك بەقەدەر درۆ لای پێغەمبەری خوا بێزراو نەبووە ، وە ئەگەر پیاوێك لای پێغەمبەری خوا قسەی بکردایە و درۆی بکردایە دڵی پێغەمبەری خوا بەرامبەری دەگۆڕا ، بەردەوام تەنگیەك لە دڵی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ بەرامبەر ئەو کەسە هەبوو هەتا دەیزانی کە ئەو کەسە تەوبەی کردوە .
لەبەر ئەوە نەکەی بهێڵی دڵی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾بەرامبەرت بگۆڕێ ..
ئایا پێغەمبەری خوات خۆش ناوێت !؟ دەڵێی : بەڵێ .
ئەی کەوایە بۆچی درۆ دەکەیت ..!؟ خەسڵەتێك کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾زۆر ڕقی لێ بووە لە نەوەی ئادەمدا بریتی بووە لە درۆ.

## درۆ لەنامەی کردەوەکانتدا دەسڕێتەوە بە ...!!

دەتبینم بە دێڕەکانی پێشودا دەچیتەوە و دەڵێی دۆزیمەوە:
( هەتا دەیزانی کە ئەو کەسە تەوبەی کردوە).

## ڕەوشتی باوەڕدار

بەڵێ : خوای گەورە دەرگای ڕەحمەتی لێ کردویتەتەوە .. درۆ لادەبرێ و دەسرێتەوە لەنامەی کردەوەکانتدا . خوای گەورە لێت خۆش دەبێت کاتێك کە تۆ تەوبەت لێ کردوە .

دە ئیستە ئاشکرای بکەو بڵێ : تەوبە دەکەین و دەگەڕێینەوە بۆ لات خوایە لە هەموو درۆیەك و پەیمانت دەدەینێ کە هەرگیز درۆ نەکەین .

## بیر بکەرەوە ... لە نیشانە بچوکەکانی ڕۆژی دوایی ..!!

**پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:**

﴿إن من علامات الساعة الصغرى كثرة الكذب ﴾. ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: یەکێك لەنیشانە گچکەکانی قیامەت زۆربونی درۆکردنە .**

**بۆچی درۆ لەنیشانە بچوکەکانی ڕۆژی دواییە ؟**

خوای گەورە ئەم بونەوەرەی بەحەق دروست کردوە وە تەنها خەسڵەتێکیش کە پێویستە ئاسمانەکان و زەوی لەسەر بوەستێت حەقە وە ئەوەش کە لەناوبەری حەقە بەتاڵ وخراپەیە.

ئایا ڕێگەی سەرەکی بڵاوبونەوەی خراپەو بەتاڵ و لەناوبەری ڕاستییەکان چیە ؟ تەنها یەك ووشە وەڵامێکی تەواوی ئەم پرسیارەیە: ( درۆ ).

هەتا خەڵکی حەق بەڕاستی بزانن و بەتاڵیش بە درۆ ئەوە لە خێردا دەژین ، بەڵام کاتێك ڕاستگۆ بە درۆزن دەزانرێ و درۆزنیش بە ڕاستگۆ بزانە کە قیامەت نزیکە .

هەر بۆیە دەڵێین : تاکو ئێستەش لە وڵاتەکانماندا و لە ئوممەتەکەماندا هیوایەکی گەورە هەیە چونکە خەڵك ڕاستی و حەق دەناسن و بە ڕاستگۆی دادەنێن ... ئەمەش فەزڵی خوایە .

## يا الله !! درۆ دەرگای گوناهە گەورەکانە !!

زانایان دەفەرمون :

( ئەوەی کە بەردەوام دەبێت لەسەر درۆ ، ئەوا توشی یەکێك لە گوناهە گەورەکان دەبێت ).

بۆچی زانایان ئەمەیان فەرمووە !؟

بەردەوام درۆ بەسەر زمانتدا دێت هەتا دەگاتە پلەیەك ، کە باوەڕ بە خۆت بکەیت و خۆت بە ڕاستگۆ بزانیت ، وە وا دابنێیت کە ئەوەی دەیڵێیت حەقە ، بەڵکو تورە دەبیت کاتێك پێت دەڵێن : ئەوەی کە تۆ دەیڵێیت درۆیە ، پاشان ئەم حاڵەتە دەگوێزیتەوە بۆ کردەوە و هەڵسوکەوتت هەتا درۆ دەبێتە عادەتێك لەلات ، ئەو وەختەش حەرامەکان حەڵاڵ دەکەیت و ............

خوای گەورە بمانپارێزێ .

## هەموو ئەمانەو ... بەڵگەشت دەوێ !!

دەڵێیت : ئەمە مەعقول نیە ... درۆ هەموو ئەم شتانە دەکات ؟

منیش پێت دەڵێم : بهێنە پێش چاوی خۆت کە کەسێك گوناهێك دەکات پێی بڵێ : چیت دەوێ بیکە ، بەڵام درۆ مەکە ، ئایا دەتوانیت ؟

نا سوێند بەخوا ناتوانیت .

بیهێنە پێش چاوی خۆت کەسێك زینا دەکات و تۆ لێی بپرسە ، چیت کردوە ؟ دەتوانێ پێت بڵێ زینام کردوە ؟ بێ گومان نەخێر درۆت لە گەڵدا دەکات .

## ڕەوشتی باوەڕدار

پاکو بێ گەردی بۆ خوا ...!! ئایا ئاگریش لە ووردە پوش و پەلاش دروست نابێت؟.

## لە پشتی کەس و کاریەوە ..!!

کچێك هاوڕێیەتی گەنجێك دەکات بە بێ ئاگاداری کەس و کاری ... تاقی بکەرەوە پێی بڵێ بەردەوام بە لەسەر ئەم پەیوەندیە ، بەڵام درۆ مەکە کاتێك باوکت لێی پرسی لەکوێ بووی ؟ درۆ مەکە دەرەنجامی کردەوەکانت قبوڵ بکە .. جا یان پەنا دەباتە بەر درۆ یان دێتەوە سەر حاڵەتی ژیری..

## ئاهەنگی شەوانەی یانەکان ... پەنا بەخوا .!!

هەموو شەوێك درەنگ دەگەڕێتەوە ماڵەوە ... وە کارێکی زۆر بچوك وسوك دەکات ، پێشی دەڵێم : چیت دەوێ بیکە . بەڵام درۆ مەکە ! دەرەنجام .. یان دەگەڕێتەوە سەر درۆ یان دوور دەکەوێتەوە لە گوناه .

## درۆ مەکەو ئارامگر بە..

دەتەوێ دەرگای گوناهە گەورەکان لە سەر خۆت دابخەی ؟

یەکێك لەو شتانەی کە ئەو دەرگایە دادەخات دورکەوتنەوەیە لە درۆ .. پێویستی بە ماندوو بوون هەیە ، پێویستی بە ئارام گرتن هەیە ، تۆش پێت وانیە کە هەرکات ئامانج گەورە بوو ... هەوڵ و تێکۆشانی گەورەی پێویستە ؟.

## پەیمانێك لەگەڵ خۆتدا ببەستە ...

ئایا ڕۆژێك لە ڕۆژان هەوڵی ئەوەت نەداوە كە پەیمانێك لەگەڵ خۆتدا ببەستیت ...!؟

ئێستە هەوڵ بدە ئەو پەیمانە ببەستیت و ئەمەش دەقەكەی بێت :

( پەیمان بێت كە لە ئەمڕۆ بە دواوە درۆ بە زمانمدا نەیەت هەر چۆنێك بێت .. دەسا خوایە كۆمەكیم بكە بۆ ئەو شتەی خۆت پێت خۆشەو لێی ڕازیت ...) .

## درۆ سەر دەكێشێ بۆ دوو ڕوویی..

ئەم ئایەتە بخوێنەرەوە و بیری لێ بكەرەوە و بۆ چەند ساتێك بێدەنگ بە...

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ لِيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِن شَاءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ الاحزاب: ٢٤

**واتە: تا خوای گەورە پاداشتی ڕاستگۆیان بەهۆی ڕاستیەكەیان بداتەوە ، هەروەها سزاو تۆڵەی دووروەكانیش بدات ئەگەر بیەوێت ، یان تەوبە و پەشیمانیان لێ وەردەگرێت ، چونكە بەڕاستی خوا هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە.**

دەبینم سەرت سوڕماوە...؟

سەرسوڕمانەكەت لەجێی خۆی دایە !! دەڵێیت : دەبوو( ویعذب الكاذبین ) بێت ، ئەی چی وای كردوە كە ( منافقین ) بێت ؟

## ڕەوشتی باوەڕدار

خوای گەورە فێرمان دەکات ئەوەی هەموو تەمەنی بە درۆزنی بەسەر دەبات ، لە کۆتایدا دەبێتە دووڕوو ، چونکە باوەڕ بناغەکەی ڕاستگۆییە ، دوو ڕوویش بناغەکەی درۆیە ، لەبەر ئەمە ناگونجێ باوەڕ و درۆ لە دڵێکدا کۆببنەوە .

# شوێنەواری درۆ لە ڕۆژی دوایدا

## ڕوخساریان ڕەش هەڵگەڕاوە ... دەبێ ئەوانە کێ بن !؟

ئاممان نەکەی دوای ئەم هەمووە سور بی لەسەر درۆ..

ئایەتێك دڵ دەهێنێتە لەرزە ، بیخوێنەرەوە و پەنا بگرە بە خوا ...

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ﴾الزمر: ٦٠

واتە: جا ڕۆژی قیامەت دەبینن ئەوانەی کەدرۆیان بەناوی خواوە دەکرد روخساریان رەش و تاریکە ، مەگەر شوێن و جێگە بۆ ئەو خۆبەزلزان و لوتبەرزانە لەئاگری دۆزەخدا نیە ؟!

جارێکی تر بیخوێنەرەوە ... بیری لێ بکەرەوە ... بە خۆت بڵێ :

( تۆ جارێ هەر لە دونیایت ) خوایە ڕوو سپیمان بکە لە ڕۆژێکدا کە هەندێك ڕوو سپین و هەندێك ڕوو ڕەشن .

## ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ڕاستگۆیان ڕاستگۆییەکەیان سوودیان پێدەگەیێنێت :

دەبینم ڕووت گەشایەوە مژدە بێت ، ئەوە دەرونی ئارامە ، دەگونجێ ڕاسگۆیی سودت پێ نەگەیەنێ لە دونیادا ، خۆ ئەمەش زۆر کەمە ، چونکە هەمیشە ڕاستگۆیی سود بەخشە ، بەڵام گریمان کە سودی پێ نەگەیاندی ... بەڵام لە دواڕۆژدا ئیتر کاتی سود وەرگرتنە لە ڕاسگۆیی ئەی کۆمەڵی ڕاستگۆیانی بڕوادار ڕۆژێك دێت زۆر ئارام و حەواوەن لەبەر ڕاستگۆیی یەکەتان .

﴿ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ۚ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ المائدة: ١١٩

**واتە:خوای گەورە فەرمووی: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ڕاستکۆیان ڕاستگۆییەکەیان سوودیان پێدەگەێنێت ، باخەکانی بەهەشت بۆیان ئامادەیە کە چەندەها ڕوبار بەژێر درەختەکانیاندا دەڕوات و بۆ هەمیشە و هەتاهەتایی لەو بەهەشتەدا دەمێننەوە و خوای پەروەردگاریش لییان ڕازی بووە و ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون ، ئەوەیە سەرفرازی گەورە و بێ سنوور.**

## بهێنە پێش چاوت...پێغەمبەران پرسیار دەربارەی ڕاستگۆییان دەکرێت !!

**خوای گەورە دەفەرموێ :**

﴿ لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ۚ وَأَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ الأحزاب: ٨

**واتە: تا لەڕۆژی قیامەتدا ، خوا پرسیار بکات لە ڕاستگۆیان دەربارەی ڕاستیەکەیان –واتە لە پێغەمبەران دەربارەی گەیاندنی پەیامەکەیان- بۆ کافرانیش سزاو تۆڵەیەکی بەئێشی ئامادە کردوە.**

پاکو بێگەردی بۆ خوا !! پێغەمبەران پرسیار دەربارەی ڕاستگۆییان دەکرێ ... پرسیار لە گەورەمان ئیبراهیم دەکرێ ... لە گەورەمان عیسی ... وە پرسیار لە ......

ئەی دەبێ چی بێ گەر پرسیار لە درۆزنان بکرێ ؟ بیهێنە پێش چاوی خۆت.. تۆ ... ئایا پرسیارت لێ دەکرێ دەربارەی ڕاستگۆییت یان دەربارەی درۆزنیت ؟ خوایە ڕەحم کەی ... ڕەحم.

## یاالله !!ئەی دەبێ ئەوە چۆن بێت کە

## لە هەموو تەمەنیدا درۆزن بووە !!

پێغەمبەر(ﷺ) لەفەموودەیەکدا باسی شەفاعەتمان بۆ دەکات... مرۆڤایەتی لەپاش وەستانێکی زۆر لە قیامەتدا ... بە ڕاستی ڕۆژێکی زۆر سەختە ... خەڵکی بە ڕوتوقوتی پەنجا هەزارساڵ دەوەستن ، خۆریش نزیك دەبێتەوە ڕۆژێکی زۆر قورسە لە ژێر ئەو ناڕەحەتیە زۆرەدا بێباوەڕان دەڵێن : خوایە ڕزگارمان بکە لەو ڕۆژە ئەگەر بەرەو دۆزەخیش بێت ! مرۆڤایەتی دەچنە لای هەموو پێغەمبران و دەڵێن : شەفاعەتمان بۆ بکە لای خوا تا لێپرسینەوە دەست پێ بکات ، هەتا دەگەنە پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) و دەفەرموێت : ( من بۆ ئەوەم .... ).

ئیتر سوجدە دەبات لە ژێر عەرشدا و خوای گەورە بانگی دەکات پێی دەفەرموێت : ئەی محمد سەرت بەرز بکەرەوە و داوا بکە پێت دەدرێت و شەفاعەت بکە شەفاعەتت وەردەگیرێت . بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

ئەوەی کە دەمەوێ ئاماژەی پێ بکەم لە فەرموودەی شەفاعەت دا ، ئەوەیە کە لە نێوان ئەو پێغەمبەرانەی کە خەڵکی دەچن بۆ لایان گەورەمان ئیبراهیمە . دەفەرموێت :

( نەفسی نەفسی ، من بۆ ئەوە نیم ، من سێ درۆم کردووە ) بە لاتەوە سەیر نەبێت ... بەڵکو بەهانەیەك بووە بۆپارێزگاری کردن لە حەق و ڕاستی کاتێك فەرمووی:

﴿ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴾ الأنبياء: ٦٣

واتە: ئیبراهیم ووتی: بۆچی لەمن دەپرسن خۆ بتە گەورەکە ساغ و سەلیمە – نەخێر هەر کاری ئەو بتە زلەیە ، دەلێیان بپرسن ئەگەر قسە دەکەن و تێدەگەن!!.

لەگەڵ ئەوەشدا گەورەمان ئیبراهیم بە درۆی ئەژمارد کردووە !.

پاکو بێگەردی بۆ خوا !! ئەی دەبێ حاڵی ئەوە چۆن بێت کە هەموو تەمەنی لە درۆدا بەسەر بردووە ... جاری وا هەیە کەسێك بە هەزارەها درۆ دەکات کەچی هەست بە خەتەرناکی ئەو حاڵەتە ناکات کە تێی کەوتووە بە ڕاستی باوەڕدار گوناهەکانی وەك شاخ دەبینێت ، بەلام دووڕوو گوناهەکانی وەك مێشولە دەبینێت .

## دەڵێن سوێند بە خوای پەروەردگارمان

## ئێمە هەرگیز موشریك نەبووین !

سبحان الله !! سورن لە سەر درۆ کردن ..

خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴾ الأنعام: ٢٣

# ڕەوشتی باوەڕدار

واتە: پاشان سەرەنجامی بێباوەڕان هیچ نەبوو بێجگە لەوەی کە وتیان: سوێند بەخوای پەروەردگارمان ئێمە هەرگیز موشریك و هاوەڵگەڕ نەبووین!!.

سەیرکە بزانە درۆ گەیشتۆتە چ ئاستێك ، لە بەردەم خوادا سوێند بە خوا دەخۆن بە درۆ ، خوای گەورەش دەفەرموێ:

﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ۚ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾ الأنعام: ٢٤

واتە: سەیرکە چۆن درۆ لەگەڵ خۆشیان دەکەن ، چۆن بیروبڕوای پوچیان لێ وون بوە و ئاسەواری نەماوە .

سەیرە لە ڕۆژی دواییشدا !! لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ لە بەردەم خوای گەورەدا !! کەچی لەگەڵ ئەوەشدا سوورە لەسەر درۆ !!.. یاالله !!.

(پەیمانەکەت لە بیربێت کە لەگەڵ خۆتدا بەستت ).

# هۆکارەکانی درۆ کردن

## بۆچی درۆ دەکەیت .....!؟

هەمیشە پزیشکەکان دەڵێن دەبێ پێش هەموو شتێك دەستنیشانی نەخۆشیەکە بکەین ئینجا چارەسەری بۆ دابنێین.

کەواتە:

بۆچی دەکەوینە درۆوە ؟ وە ئەو هۆکارانە چین کە وامان لێ دەکەن درۆ بکەین ؟

ئێستە ... ئایا تۆ ئامادەی بۆ پشکنینی نەخۆشیەکە ؟ پزیشکەکەمان زیرەکە ... پشکنینەکەی ئەنجام داوە و لێهاتوویی خۆی سەلماندووە و چوار هۆکاری بۆ دەستنیشان کردووین:

## هۆکاری یەکەم : بۆ ڕزگار بوون لە تەنگانەیەك..

هۆکارێکە زۆر باوە ... بۆ ڕزگار بوون لە تەنگانەیەك ، وە هەموو کەس مەگەر ئەوەی کە خوا ڕەحمی پێ بکات کەوتۆتە ئەو هۆکارەوە ... بۆ نموونە :

بەیانی تا ئێوارە لەماڵەوە بەدیار تەلەفیزیۆنەوە دانیشتووە ، مێردی هەژاریش دوای ماندووبونی ڕۆژێك سەرتاسەرە بەشەوقەوە دەپرسێت ، کوا چێشت و خواردنەکەمان ؟ ئیتر ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕێ و .... درۆ دەکات و دەڵێ : ئای من نەخۆشم ..

## ڕەوشتی باوەڕدار

یەکێکی تریش گرنگی بەوانەکانی نادا و لە تاقیکردنەوەکاندا دەرناچێت ، بەڵام تا دەگاتەماڵەوە بیر لەوە دەکاتەوە چ درۆیەك ڕێك بخات تاکو خۆی لەم تەنگانەیە ڕزگار بکات.

بینیت کە ئەم هۆکارە خاوەنەکەی دەخاتە تەنگانەیەکی لەمەی ئێستە قورستر و دوور یان نزیك درۆکەی ئاشکرا دەبێت .

لە ئەسەردا هاتووە:

( بە دوای ڕاستگۆییدا بگەڕێن ئەگەر لە ناوچونیشی تیا بێت ، چونکە ڕزگار بوونی تیایە ).

سوێند بەخوا ... ڕاستگۆیی ڕزگاربونی تیایە ، ئاممان ئاگاداری ئەم هۆکارە بە .

## گەر ڕاستگۆیی بخەیتە سەر برینێك چاك دەبێتەوە..

زانایان وتەیەکی زۆر بەهێزیان فەرمووە کە پێویستی بە بیرکردنەوە هەیە ... دەڵێن :

( گەر ڕاستگۆیی بخەینە سەر برینێك چاك دەبێتەوە ).

جا ئەگەر جارێك لە جاران هەڵەت کرد و درۆیەکت کرد و دەرونت پێی بریندار بوو ، ئەوا مەرهەمی ( ڕاستگۆیی ) بۆ بەکاربێنە بە پشتیوانی خوای گەورە چاك دەبێتەوە .

**تێبینی:**

هەندێك جار ... مەرهەمی چارەسەر ئازارت دەدات ... تکایە ئارامی لەسەر بگرە ، بە پشتیوانی خوا چاك دەبیتەوە .

## عومەری فاروق فێرمان دەكات ..

ووشەیەكی زۆر جوان ... خۆتی بۆ ئامادە بكە ... عومەی كوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەفەرمویٚ:

( گەر ڕاستگۆیی دام بەزێنێت – كە كەم جایش دام دەبەزێنێت – پێم خۆشترە لەوەی كە درۆ بەرزم بكاتەوە كە كەم جاریش بەرزم دەكاتەوە)!.

ئایا ئەمەت بەس نیە كە ڕاستگۆیی لەلای خوا بەرزت بكاتەوە ؟.

كامیانت پیٚ خۆشترە ، پلەو پایەت لای خوا بەرزبێتەوە .... یان لای خەڵكی؟.

## سوێند بە خوا یەك درۆم نەكردووە ...

ئێستا چەند ووشەیەك دەخوێنیتەوە ئیرادەت بەهێز دەكات، عەزیمەتت كڵپە دەستێنیٚ وحەماسەتت زیاد دەبیٚ و هەست بە گەشەكردنی سەركەوتن دەكەیت ، عومەری كوڕی عبدالعزیز دەفەرمویٚ :

( سوێند بە خوا یەك درۆم نەكردووە لەو كاتەوەی كە زانیومە درۆ سوكییە بۆ خاوەنەكەی ) .

سوێند بە خوا هەمووومان دەزانین كە درۆ سوكیە بۆ خاوەنەكەی ، بەڵام كوا عومەری كوڕی عبدالعزیز؟.

## حەقیقەتی ڕاستگۆیی..

جونەید قسەیەك دەكات كە لەدڵەوە دەرچووە ، بۆیە ئینشاالله دەگاتە دڵیش ، دەڵێت:

( حەقیقەتی ڕاستگۆیی ئەوەیە كە ڕاستگۆبی لەحاڵەتێكدا بە درۆ نەبێ ڕزگارت نابێ )!!.

ئایا گەیشتە دڵت ... !؟

جارێكی تر بیخوێنەرەوە جێبەجێكردنەكەی قورسە .... بەڵام سوپاس بۆ خوا پاش ئەوەی بویتە عومەریی !! ئاسان بووە .

## چیرۆكێك سود بە مسوڵمانان دەگەیەنێت..

ئەو مرۆڤە كامەیە كە دەترسی لێت توورە بێت .... باوكت ؟ دایكت ؟ هاوسەرت ؟ مێردەكەت ؟ ....؟ كێ زۆر زیاتر ؟ دەترسی كێ لێت توڕە بێت ؟.

ئەمە چیرۆكێكە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) دا ڕوی داوە:

لە جەنگی (تەبووك)دا ، (٣٠) هەزار هاوەڵ لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) دەرچوون ، ئەم جەنگە لە مانگی (ئاب)دا بوو گەرما زۆر بە هێز بوو زۆر دوور بوو نزیكەی هەزار كیلۆمەتر دەبوو ... دووڕووەكان كەوتنە بەهانە هێنانەوە و دواكەوتن ... بەڵام سیان لە هاوەڵە ڕاستگۆكانیش دواكەوتن تیایاندا ئەو هاوەڵەی كە بەسەرهاتەكەمان بۆ دەگێڕێتەوە ، ئەویش گەورەمان كەعبی كوڕی مالیكە..

( خۆت بخەرە شوێنی كەعبی كوڕی مالیك لە هەموو ئەم بەسەرهاتەدا و پێم بڵێ بزانم چی ئەكەیت )!؟...

کەعب دەفەرموێ :

پێغەمبەر (ﷺ) و سوپاکەی دەرچوون و منیش دەمووت ، سبەینێ پێیان دەگەم .. سبەینێ دەهات دەمووت سبەینێ دەچم و پێیان دەگەمەوە.. هەتا وای لێهات هەرچیەکم بکردایە پێیان نەدەگەیشتمەوە بەناو شەقامەکانی مەدینەدا دەگەڕام ، کەسم نەدەبینی مەگەر دووڕوویەك نەبوایە ، یان نەخۆشێکی پەککەوتە ..

کاتێك دەنگوباسی گەڕانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ئاراوە ، کەوتمە دەریای خەمەوە ، بە خۆمم ووت: چی بە پێغەمبەر(ﷺ) بڵێم ..؟ چۆن لە تووڕەبونی دەرچم ؟ وردە وردە بیرم لە درۆ کردەوە ( سبحان الله ، کەعب ئەوەت بۆ وەسف دەکات کە ڕوو دەدات ، ئەمە ئەو شتەیە کە ڕوو دەدات لەکاتی ئەنجامدانی هەر هەڵەیەك دا ).

بەڵێ : نەفسم سەبارەت بە درۆ قسەی لەگەڵ دەکردم ، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە خراپەم لە خۆم دوور خستەوە و ڕاستگۆییم لەخۆمدا بەرجەستە کرد ... پێغەمبەر (ﷺ) چووە ناو مزگەوت و دانیشت ... دووڕووەکان خێرا چوونە لای و دەیان وت:

( بمان بوورە ئەی پێغەمبەری خوا )..

سوێندیان دەخواردو پێغەمبەریش لێی قبوڵ دەکردن و لێیان خۆش دەبوو ، بەیعەتی لەگەڵ نوێ دەکردنەوە و نهێنیەکانی واز لێ دەهێنا بۆ خوای گەورە ، ئیتر بەوپەڕی دڵخۆشی دەهاتنە دەرەوە !.

سەرەی من هات ( بیهێنە پیش چاوی خۆت تۆ کەعبی کوڕی مالیکیت و دوا کەوتووی لە جیهاد و پێغەمبەری خوات بەجێ هێشتووە ، ئێستا دەچیتە بەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی پێ دەڵێیت؟) .

## ڕەوشتی باوەڕدار

چومە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی ، بەڵام پێکەنینی تووڕەیی ، پێی ووتم :

– وەرە .. چی دوای خستی ؟ ئایا کەلوپەل و وشترت نەکڕی بوو ؟

ووتم :

– ئەی پێغەمبەری خوا ، سوێند بە خوا گەر لای هەر کەسێکی تر لە پادشاکانی دونیادا دابنیشتمایە جگە لەتۆ بە بەهانەیەك خۆم لە توڕەییەکەی دەرباز دەکرد ، ئەی پێغەمبەری خوا من ئێستا گەر بە قسەیەك تۆ ڕازی کەم ئەترسم لەوەی خوای گەورە ئاگادارت کاتەوە و توڕەت بکات لێم خۆ گەر ڕاستیش بدوێم ئەوا بە ئومێدی لێ خۆشبونم ، سوێند بە خوا هیچ بە هانەیەکم نەبوو .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی:

– بەڵام ئەمەیان ڕاستگۆ بوو ، هەستە هەتا خوا بڕیارێك دەدات دەربارەی تۆ ..بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

لێرەدا مانایەکی گرنگ هەیە :

کە ڕاستگۆ بووی مانای وا نیە کە سزا نادرێیت ، کەعب دەفەرموێ : هەستام و پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری دا کە ئەم سیانەمان بۆ ماوەی ٤٠ ڕۆژ قسەمان لەگەڵدا نەکرێت ، ماوەکە درێژ کرایەوە بۆ پەنجا ڕۆژ .

کەعب دەڵێت :

کاتێك لای پێغەمبەر (ﷺ) گەڕامەوە خەڵکانێك لە خێڵی( بنی سلمه ) کە یەکیك بوو لە خێڵەکانی ئەنسار پێیان دەوتم :

– بۆچی وەکو فلان و فیسارت نەدەوت و بەهانەیەکت نەدەوت ، پێغەمبەر (ﷺ) لێت خۆش دەبوو ، نەت بینی پێغەمبەر (ﷺ) لێیان خۆش دەبوو..!!.

له زۆری قسەکانیان وام بۆ دروست بوو کە بگەڕێمەوە و درۆ بکەم بەڵام گەڕامەوە سەر ژیری خۆم و بەردەوام بووم ...

پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری دابوو بۆ ماوەی پەنجا ڕۆژ قسەمان لەگەڵدا نەکرێت هەتا ئایەت هاتە خوارەوە و قبوڵی تەوبەکەمانی ڕاگەیاند..

وە سبحان الله ئەوەی جێی سەرنجیشە ئایەتەکان بەمە کۆتایی پێ دێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ التوبة: ١١٩

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە لەخوابترسن و پارێزکار بن ، هەوڵ بدەن هەمیشە لەگەڵ ڕاستگۆیان و ڕاستاندا بن .

– چوم بۆ مزگەوت بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) سەیری کردم ، ڕووی دەدرەوشایەوە لەخۆشیدا ، ووتم :

– ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەخوا هیچ شتێك ڕزگاری نەکردم ڕاستگۆیی نەبێت وە ئیتر لەمەودوا قسە ناکەم بە ڕاستگۆیی نەبێت ، وە سوێند بە خوا دوای ئەوە یەك درۆم نەکردوە وە من داواکارم لە خوای گەورە یارمەتیم بدات بەردەوام بم لەسەری هەتا دەمرم..

( بەڕاستی چیرۆکێکە سود بە مسوڵمانان دەگەیەنێ ، ئایا دەتوانیت بەراوردی خۆت بە کەعبی کوڕی مالك بکەیت ؟ ئایا ناتەوێ خوا لێت خۆش بێت)؟

## هۆکاری دووەم : بۆ دەستکەوتنی سودێك..

هۆکارێك سەر دەکێشێ بۆدووڕوویی..

## ڕەوشتی باوەڕدار

ئەم هۆکارە زۆر پیستر و خراپترە لە هۆکاری یەکەم ، درۆ بکەی بۆ ئەوەی سودێکت پێ بگات ، پلەو پایەیەکت دەست بکەویت ، پارەیەکت دەست بکەوێت ، پلەیەکی کۆمەڵایەتیت دەست بکەوێت .. کە دیارە ئەمە هۆکارێکە سەر دەکێشێت بۆ دووڕویی لەبەر ئەوەی تۆ تەنها بە درۆکە تەواو نابیت بۆ دەستکەوتنی سودێکی دونیایی بەڵکو حەرامەکانیش حەڵاڵ دەکەیت تکایە زۆر ئاگادار بە ! ئەم هۆکارە زۆر خەتەرناکە .... زۆر دەترسم تێی بکەوی بەڵام نا... ئەوە تۆنیت تێی دەکەوی ...من متمانەم پێتە .

## ئەبوجەهل لە هەڵوێستێکی سەیردا ..

هەڵوێستێك کە زۆرێك لە خەڵکی نایزانن ... هەموو وا دەزانن کە ئەبو جەهل باوەڕی بە پێغەمبەری خوا نەکردووە و بەدرۆی خستۆتەوە ، لەبەر ئەوەی پێی وابووە کە پێغەمبەر درۆزن بووە ، بەڵام حەقیقەت شتێکی ترە ....

ئەو باش دەیزانی کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ڕاستگۆیە..

**ئەمەش هەڵوێستەیەکە:**

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەلای ئەبوجەهل وهاوەڵێکیدا تێپەری ، ئیتر پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وەك کاری خۆی بانگی کردن بۆ ئیسلام ، ئەبو جەهل ووتی : ئەی محمد تۆ درۆزنی و ، باوەڕت پێ ناکەم ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ زۆری پێ ناخۆش بوو بۆیە جێی هێشتن ، ئەبوجەهل بە هاوەڵەکەی ووت: – کە دواتر موسوڵمان بوو – من دەزانم کە ئەو ڕاستگۆیە بەڵام ئەوەی کە ڕێگریم دەکات لەوەی باوەڕی پێ بێنم خێڵەکەمە ، من و

خێڵی( عبدالمناف ) ( خێڵی پێغەمبەر ) هەمیشە لە کێبەرکێ داین ، دەڵێن ئەوە لە ئێمەیە ئێمەش دەڵێین ئەوە لە ئێمەیە ، هەتا ووتیان : پێغەمبەر لە ئێمەیە ... ئیتر چۆن باوەڕی پێ دەهێنین ؟!.
بەلاتەوە سەیر نەبێ ... ئەوە ئەبوجەهلە ... سوور بووە لەسەر بەرژەوەندی خودی خۆی ، ئەمەش خستیە کرۆکی جەهەننەم خوای گەورە بمان پارێزێ ، ئامان نەکەی وەکو ئەو بی.

## هۆکاری سێهەم :بۆ ئازاردانی خەڵکی..

**هۆکارێکی خەتەرناک:**

یاالله !! درۆ دەکات بۆ ئازاردانی خەڵکانی تر ... بۆچی ؟
لەبەر ڕق و حەسودی ... ڕقی لە کەسێکە درۆ دەکات هەتا بیخاتە ناو کێشە و ناڕەحەتی‌یەوە ... ڕقی لە فلان ئافرەتە دێت تۆمەت بۆ شەرەفی دروست دەکات ... ئەمە هۆکارێکە مرۆڤایەتی تێکدەشکێنێ ، هۆکارێکە کەتیایدا شەیتان لێهاتنەکانی خۆی بە کار دەهێنێ ..

## لە براکانی یوسف پەند وەرگرە ...

ئەم هۆکارە(درۆکردن بۆ ئازاردانی خەڵکی ) وای لە براکانی یوسف کرد کە کارێکی چاوەڕوان نەکراو ئەنجام بدەن ... چیان کرد دەرەنجامی ڕق و حەسودی ؟

﴿ اَقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِن بَعْدِهِ قَوْمًا صَالِحِينَ ﴾ يوسف: ٩

واتە: لەناو خۆیاندا هەندێکیان ووتیان یوسف بکوژن ، یان فڕێی بدەنە شوێن و زەویەکی دوور ئەوکاتە ڕووی باوکتان یەکلایی دەبێتەوە بۆ ئێوە و

**خۆشەویستیەکەی هەمووی بۆ ئێوە دەبێت ، ئینجا دوای نەمانی یوسف ئێوە دەبنە پێر و نەوەیەکی چاك و ڕێکوپێك.**

**دوو درۆیان کرد ، یەکەمیان بە گوفتار و دووەمیان بەکردار .**

**ئەوەی بە گوفتار بوو:**

﴿ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَـٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَـٰدِقِينَ ﴾ يوسف: ١٧

**واتە:وتیان ئەی باوکی بەڕێزمان ئێمە ڕۆیشتین پێشبڕکێمان دەکرد و یوسفمان لای کەلوپەلەکەمان بەجێهێشت ، ئەوسا گورگەکە پەلاماریداو خواردی ، بەڵام تۆ هەمیشە بڕوامان پێ ناکەیت ئەگەرچی ئێمە ڕاستگۆش بین .**

**ئەمەش بە کردار بوو:**

﴿ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍ ﴾ يوسف: ١٨

**واتە: براکانیشی هاتن بە هەندێ خوێنی ساختەوە کەبەسەر جلەکانیەوە بوو .**

**پاکو بێ گەردی بۆ خوا !! دەرەنجامی ڕق و حەسودی بیر کردنەوەیە لە کوشتن ...**

**خوا چی پێ کردن ؟ هیلاکی و ماندووبونی بیست ساڵ هەتا ئەو کاتەی یوسف دەرکەوتەوە .**

**ئەمەش سەیرکە ... خوای گەورە لەسەر زمانیان دەفەرموێ:**

﴿ وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَـٰدِقِينَ ﴾ يوسف: ١٧

**واتە: بەڵام تۆ هەمیشە بڕوامان پێ ناکەیت ئەگەرچی ئێمە ڕاستگۆش بین!!.**

**سبحان الله ...**

**درۆزن لەسەر زمانی خۆی درۆکەی دەردەکەوێت .**

## هۆكاری چوارەم :درۆ لەبەر درۆ..

سوێند بەخوا ئەمە هۆكارێكی غەریب و پێكەنیناویە ، درۆ دەكات لە بەر درۆیەك ، حەزی لە درۆیە ، چێژی لێ وەردەگرێ ... چی پێ بڵێم ؟ ئایا ئەم هەموو ئایەت و فەرموودە ڕاچڵەكێنەرانەی بەس نیە ؟

## درۆ و باوەڕ كۆنابنەوە..

پرسیار كرا لە پێغەمبەر (ﷺ):

دەگونجێت باوەڕدار ترسنۆك بێت ؟ فەرمووی : بەڵێ ، ووتیان : دەگونجێ باوەڕدار بەخیل بێت ؟ فەرمووی : بەڵێ ، ووتیان : دەگونجێ باوەڕدار درۆزن بێت ؟ فەرمووی : نەخێر. ئیمام مالیك ریوایەتی كردوە.

دەتبەخشین لەوەی لە حاڵەتێكدا نەفست لاواز بوبێت و نەتبەخشیبێ ، بەڵام درۆ هیچ بەهانەیەكی نیە .

سبحان اللە !! درۆ و باوەڕ... هەرگیز كۆنابنەوە .

## پوختەی هۆكارەكانی درۆكردن

- بۆ ڕزگار بوون لە تەنگانەدا .
- بۆ دەست كەوتنی سودێك
- بۆ ئەزیەت دانی خەڵكی
- درۆ لە بەر

# جۆرەكانی ڕاستگۆیی

## جۆری یەكەم : ڕاستگۆیی نییەت..

مەبەستمان لە نیەت ڕاستی ئەوەیە كە بە هەر گوفتارێك كە لە دەم و دەست دەردەچێ مەستت پێی ڕەزامەندی خوا بێت ... گەر وات كرد ئەوە تۆ ڕاستگۆی لە نیەتتدا .

ئایا دەتوانی وا بكەی ؟ وا دەزانم زیرەكیت ... كەواتە لە ئێستەوە دەست پێ بكە ، چونكە تۆ تەنها بۆ زانین ناخوێنیتەوە بەڵكو بۆ جێبەجێ كردنە !.

## بۆ ئەوەی لە پێناوی خوادا بیبەخشم..

دەمەوێ دەوڵەمەند بم ... لە خۆت بپرسە ؟ ... ( بۆ ئەوەی بەختەوەر و دەوڵەمەند بم ) .

نەخێر ... دەتەوێ دەوڵەمەند بیت و لەسەر ئەوەش پاداشت وەرگری ؟ ڕاستگۆ بە لە نیەتت دا .

ئەمە چۆن ؟

هەوڵ بدە لە كارەكەتدا ... هەوڵ بدە لە كۆكردنەوەی پارەی حەڵاڵدا بۆ ئەوەی لە پێناوی خوادا بیبەخشی ... بەو نیەتەی كە خەڵك دەتبینێ كە كەسێكی دەوڵەمەندی لەخوا ترسی ، ئیتر دین لەلای خەڵكی زیاتر خۆشەویست دەكەی ... بەو نیەتەی گرنگی بە ڕوكار و جل و بەرگم بدەم ئەو كات دین لەلای خەڵكی جوانتر و خۆشەویستتر دەكەم ... بەو نیەتەی كە نەبمە بار بە سەر كۆمەڵگەوە ، بەو نیەتەی:

﴿ نعم المال الصالح للرجل الصالح ﴾ .

واتە: باشترین ماڵی چاك ئەوەیە بەدەست پیاوێكی چاكەوە بێت .

## بۆ ئەوەی خۆم پاك بكەمەوە و ، ماڵێكی موسوڵمان دروست بكەم..

دەمەوێ هاوسەر بگرم ... لە خۆت بپرسە بۆچی ؟
( لەبەر ئەوەی ژیان وایە و هەر دەبێ ژن بهێنی ) .
نا ... دەتەوێ هاوسەرگیری ئەنجام بدەیت و پاداشتت بۆ بنوسرێ ؟
نیەتت ڕاست بكەرەوە . چۆن ؟
بەو نیەتەی كەمن دەمەوێ پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام بدەم بۆ ئەوەی پاك ببمەوە ... بە نیەتی ئارامی دەرونی و پەرستنی خوا لەسەر باشترین شێوە ، بە نیەتی كردنەوەی ماڵێكی موسوڵمان ، بە نیەتی یارمەتی دانی یەكتری لەسەر خواپەرستی ... بەم شێوەیە هەموو ساتەكانی ئەو هاوسەرگیریەت بۆ دەبێتە بەندایەتی ... كارەكەش زۆر ئاسانە .

## بۆ ئەوەی جارێكی تر سەلاحەدین لە دایك بێت..

ئەتەوێ وەچەت هەبێت ؟ ... بۆچی ؟
( لەبەر ئەوەی كەس گاڵتەم پێ نەكات) نا ... ئەتەوێ وەچەت هەبێت و پاداشتی لەسەر وەگری ؟ نیەتت ڕاست بكەرەوە .
چۆن ؟ بەو نیەتەی وەچەیەك بخەیتەوە كە خواپەرست بن ، بە نیەتی بونی چەند كۆرپەیەك كە خوایان خۆش بوێت ، بە نیەتی جارێكی تر

## ڕەوشتی باوەڕدار

لە دایك بوونی سەلاحەدین ... بە نیەتی جارێکی تر لەدایك بوونی خالیدی کوڕی وەلید ... بە نیەتی بوونی منالی چاك و باش:

﴿ ولد صالح يدعوا له ﴾ .

واتە: وەچەیەکی چاك کە نزای خێری بۆ بکەن .

## وەرن بۆ کێکوێك لە چاکە..

سبحان الله ! مرۆڤ دەتوانێ کێوێك لەچاکەی دەست کەوێت و لە ماڵەوەش دانیشتبێت ، یان لەسەر جێگەکەی بێت ... بە نیەتی ڕاست و ڕاستگۆیانە :

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

﴿من طلب الشهادة بصدقٍ بلغه الله منازل الشهداء و ان مات على فراشه ﴾

موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

واتە: هەرکەسێك بەدڵ داوای پلەی شەهید بون بکات، خوای گەورە دەیگەیەنێتە پلەی شەهیدەکان گەرچی لەسەر جێگا گیانی بسپێرێت !!

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ فَإِذَا عَزَمَ الْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا اللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴾ محمد: ٢١

واتە: کە گوێڕایەڵ بونایە و قسەی جوان و بەجێیان بکردایە ، جا کاتێك کا گەیشتە قایمی و جەنگ بەرپابوو ئەگەر لەگەڵ خوا ڕاستبونایە ئەوە چاکتربوو بۆیان..

وا دەزانم بەم نیەتە ژیانمان دەگۆڕێت ... دەکرێ بەنیەتێکی ڕاستگۆیانە پلەی شەهیدی بۆ خۆمان مسوگەر بکەین و لەسەر جێگەکەشمان بمرین ... بەس نیەتت چاك بکە ، ڕاستگۆ بە ، دەبینی هەموو ڕۆژەکەت بووە بە بەندایەتی بۆ خوا ..

## دنیا بۆ چوار کەسە..

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نمونەیەکی زۆر جوان دەهێنێتەوە .... دەفەرموێ:

دونیا بۆ چوار کەسە..

وە لە فەرموودەکە دا هاتووە :

یەکەم :

پارەی هەیە و گوێڕایەڵیشە بۆ خوا ، پارەکەی بەشەو و بە ڕۆژ لە پێناوی خوادا دەبەخشێت .

دووەم :

بە شێوەی یەکەم پارەی نیە ، بەڵام دەڵێ : گەر منیش وەکو فلان پارەم هەبوایە ئەو کارانەم دەکرد کەئەو دەیکات .

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:

( ئەم دووانە لە پاداشت دا وەکو یەك وان ). ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

## بیهێنە پێش چاوت ... لە ڕۆژی دواییدا لە چاکەکانتدا دروست کردنی مزگەوت هەیە ..

بەڵێ ... باوەڕ بکە ... دەگونجێ شتی وا ڕوو بدات بە پشتیوانی خوای گەورە ، چونکە تۆ بە نیەتێکی ڕاست و ڕاستگۆوە وتووتە : گەر پارەم هەبوایە مزگەوتێکم دروست دەکرد ... خوا ڕاستگۆیی‌یەکەت دەزانێت ، ڕۆژی دوایی دێت و دروستکردنی مزگەوتێك لە تای ترازووی چاکەکانتدا هەیە .

دەی ئێستا نیەت بێنە ، وە لە یادت بێت :

ڕەوشتی باوەڕدار

( کارێکی بچوك نیەت گەورەی دەکات کارێکی گەورەش نیەت بچوکی دەکاتەوە) .

## بێنە پێش چاوی خۆت لە ڕۆژی دوایی دا لە پلەی کەسێکی کە دنیای پڕ کردووە لە بانگەواز بۆ لای خوا..

ئایا ڕۆژێك بەسەرتدا نەهاتووە وتبێتت : گەر منیش بە ئەندازەی فلان زانا زانستم پێ بوایە دونیام پڕ دەکرد لە بانگەواز ، دیارە ئەمەت بە نیەتێکی ڕاستگۆیانە وتووە ، خوا بۆی نوسیوی . لە ڕۆژی دواییدا بە قەدەر ئەو زانایە بگرە زیاتریشت بۆ دەنوسرێ چونکە دڵسۆز بووی لە دوعاکەتدا.

گەر دەتەوێ چاکەکانت زۆر ببێ و ببێتە کێوێك لە ڕۆژی دواییدا ، ئەم نیەتە بهێنە بەڵام بە ڕاستگۆیی !.

## جۆری دووەم : ڕاستگۆیی زمان..

پێش ئەوەی بچینە کرۆکی باسەکەوە پێم خۆشە ئەو نزایەی پێغەمبەری خوات (ﷺ) بیر بهێنمەوە کە دەفەرموێ:

« اللهم انی اسألك لسانا صادقا » . ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

واتە: خوایە داوای زوبانێکی راستگۆت لێ دەکەم .

ئەمە چیە ... ؟

پێغەمبەر (ﷺ) دوعا دەکات و ئەمە دەڵێ ؟ ئەی ئێمەی هەژار چەند جار ئەم دوعایە دەکەین ؟ ... لە وەڵامەکەی زۆر دەترسم ...

وەسیەتێك :

( له پاش هەموو نوێژێکەوە ئەم دوعایە بخوێنە ) .

## ڕاستگۆیی زمان لەگەڵ قورئاندا..

ڕاستگۆیی زمان چەند جۆرێکی هەیە ، لەوانە ڕاستگۆیی زمان لەگەڵ قورئاندا .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

﴿ من قال في القرآن بغير علم . فليتبوأ مقعده من النار ﴾ . ترمزی ڕیوایەتی کردوە .

واتە: هەرکەسێك بێ زانیاری لەبارەی قورئانەوە بدوێت با جێگەی خۆی لەدۆزەخدا ببینێتەوە .

ئاممان نەکەی فەتوا بدەی یان ڕاڤەی قورئان بکەی لەکاتێکدا کە نەزانی چی دەڵێی یان دەربارەی قورئان شتێك بڵێی کە لەگەڵ شێوازەکانی زمانی عەرەبیدا نەگونجێ .

نەکەی لەوانە بی کە دەربارەی ئایەتی باڵاپۆشی دەڵێن : مەبەست لەم ئایەتە تەنها خێزانەکانی پێغەمبەرە (ﷺ) نەك هەموو ئافرەتان ...

ئاممان وریای درۆ بن لەگەڵ قورئاندا .

## درۆ بەدەم پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەکەی !؟

لە جۆرەکانی ڕاستگۆیی زمان ، ئەوەیە کە ڕاستگۆ بی لە وتنەوە و باس کردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

﴿ من كذب علي متعمداً فليتبوأ مقعده من النار ﴾ . بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هەرکەس درۆم بەدەمەوە بکات بە ئەنقەست با جێگەی خۆی لەدۆزەخدا ببینێتەوە .**

**لەبەر ئەوە باشتر وایە کاتێك دڵنیا نیت لە فەرموودەیەك بڵێی: ﴿او کما قال﴾ یان ﴿ ان صحت هذه الروایة ﴾ چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿ من روی عني حدیث ، و هو یری انه کذب فهو احد الکاذبین ﴾.

ئیبن ماجە ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هەرکەسێك فەرمودەیەك لەمنەوە بگێڕێتەوە ،بزانێت کەدرۆیە ، ئەوە خۆی یەکێکە لەدرۆزنەکان .**

**کەواتە ئەی ئەو کەسەی درۆ دەکەی بەدەم پێغەمبەروە (ﷺ) شوێنت لەئاگردا دیاری بکە**

**گەر دەتەوێ ڕزگاریشت بێت ، بگەڕێوە بۆ لای خوا داوای لێ خۆشبوون بکە و هەرگیز ڕو لەو کارانە نەکەیتەوە ....!.**

## یالله !! لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان !

**لە جۆرەکانی ڕاستگۆیی زمان ڕاستگۆییە لە بازرگاندا..**

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿ التاجر الصدوق الأمین مع النبیین و الصدیقین و الشهداء ﴾.

ئیبن ماجە ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: بازرگانێکی ئەمینی ڕاستگۆ لەرۆژی دوییدا لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیداندایە .**

**وا دەزانم ئەم فەرموودەیە دڵخۆشت دەکات برای بازرگان ، هیوادارم هەر کەس بازرگانێك دەناسێت یان لێی نزیکە یان دراوسێیەتێ ئەم فەرموودەیەی پێ بگەیەنێ**

**هەروەها ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:**

**﴿ يا معشر التجار ﴾ کاتێك سەریان بەرز کردەوە فەرمووی:**

﴿ إن التجار يبعثون يوم القيامة نجاراً إلا من اتقى و برّ و صدق ﴾.

ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: ئەی کۆمەڵی بازرگانەکان، کاتێك سەریان بەرزکردەوە، فەرموی: بازرگانەکان بەتاوانباری لەڕۆژی قیامەتدا زیندو دەکرێنەوەو ، جگە لەوانەی پارێزگارنو چاکەخوازو ڕاستگۆن .**

**چەند خەمباری ئەی بازرگان بە ووشەی ﴿ ان ﴾ بەڵام چەند دڵخۆشی بە وشەی ﴿ إلا ﴾.**

**جا گەر دەتەوێ خەمت کۆتایی پێ بێنی و بەختەوەریت تاسەر بێت ئەوا لەخوا بترسە و چاکەکار و ڕاستگۆبە.**

**هەروەها ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:**

﴿ البيّعان بالخيار مالم يتفرقا . فان صدقا و بينا بورك لهما في بينهما . و إن كذبا و كتما نعسي أن يربحا ربحاً و تمحق بركة بيعهما ﴾. بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: کڕیارو فرۆشیار هەدوکیان سەرپشکن تا لێك جیانەبنەوە (دورنەکەونەوە) گەر ڕاستیان کردو بەڕونی مامەڵەیان کرد، بەرەکەت دەکەوێتە نێوانیانەوە، گەر درۆیان کردو شاردیانەوە لەوەدەچێت تۆزێك قازانج بکەن بەڵام بەرەکەتی نێوانیان هەڵدەگیرێت .**

**ئامان نەکەن عەیبوعاری شمەکەکانتان بشارنەوە چونکە سوێند بەخوا بەرەکەت ناهێڵێ .**

## ڕەوشتی باوەڕدار

**وەسیەتێك :**

**( هەوڵ بدە بەوپەڕی ئەدەب و نەرمی و لەسەرخۆیی ئەم مانا جوانە بکەیەنێت بە بازرگانەکان ، بەڵام وریابە نەکەی بەجۆرێك بیگەیەنی پێچەوانەکەی ڕو بدات ).**

## گەورەترین گوناهە گەورەکان ...؟!

## خۆزگە بێدەنگ بوایە :

**لەجۆرەکانی ڕاستگۆیی زمان : ڕاستگۆییە لە شایەتیداندا..**

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :**

﴿ الا أنبأكم بأكبر الكبائر ؟ قالوا بلى يارسول الله . قال : الشرك بالله . و عقوق الوالدين . و قتل النفس . وكان متكئا و جلس و قال: ألا و قول الزور و شهادة الزور . الا و قول الزور و شهادة الزور. فما زال يرددها حتى قلنا : ليتهُ سكت ﴾ .

**واتە: ئایا گوناهە هەرە گەورەکانتان بۆباسبکەم؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموی هاوەڵ بڕیاردان بۆخوای گەورە، ومرۆڤ کوشتن، جا شانی دانابو ئەوجا دانیشت و فەرموی : هەروەها قسەی درۆو شایەتی دانی درۆ.. هەروەها قسەی درۆو شایەتی دانی درۆ.. ئەوەندە ئەم قسەی دوپاتکردەوە،سۆزمان بۆی جوڵاو وتمان خۆزگە ئەوەندە خۆی ماندو نەکردایەو بێدەنگ دەبوو ..**

**وابزانم لەسەر زمانت بوو پێش ئەوەی هاوەڵان بیلێن ....**

**نەکەی شایەتی درۆ بدەی لەهەر جێگەیەکدا بێت ، چونکە لە گوناهە گەورەکانە.**

## ئایا ئەمە ..... وەك ئەوەیە !؟

چەندە درۆكە گەورە بێت و زیانی بۆ كۆمەڵگە زیاتر بێت ئەوەندە سزاكەی لە ڕۆژی دواییدا گەورەتر دەبێت ، چونكە درۆ هەمووی یەك پلە نیە ، هەر وەك لێپرسینەوەكەش بەیەك شێوە نیە.
لا حول و لا قوه الا بالله ..

## لێرەدا ... ڕاستگۆیی زۆر گرنگە ..

هەروەها لە جۆرەكانی ڕاستگۆیی زمان.. ڕاستگۆیی نێوان هاوسەرانە.. ئەمە لەشتە گرنگەكانە ، گەر نەخۆشی ئاگاداری بكەرەوە ، هەروەها تۆش .. با بناغەی سەرەكی ڕاستگۆیی بێت لە نێوانتاندا .. كاتێك هەنگاوی یەكەم دەنێی بۆ هاوسەرگرتن باهەموو شتێك ڕۆشن بێت و هیچ مەشارەوە و شەرم مەكە .. دڵنیابە خوا هاوكاریت دەكات .

## باوكم دەڵێ : بڵێ لەماڵ نیە !!

لە جۆرەكانی ڕاستگۆیی زمان : ڕاستگۆییە لەگەڵ منداڵدا هەتا منداڵان ڕاستگۆیی لە دایك و باوكیانەوە فێر ببن..
پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵی هاوەڵێك دانیشتبوو خێزانی ئەو هاوەڵە منداڵەكەی بانگ كردو ووتی: وەرە با شتێكت بدەمێ.. پێغەمبەر (ﷺ) سەیری كرد و فەرمووی دەتەوێ چی بدەیتێ ؟ ئایا شتێكت پێیە بیدەیتێ ؟ ئەویش ووتی بەڵی خورمام پێیە ئەی پێغەمبەری خوا..
پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی:

**( خۆ ئەگەر شتێکت پێ نەبوایە بیدەیتێ ئەوا درۆیەکت بۆ دەنوسرا ).**

ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە.

**گەر ئەوەی ئەمڕۆ ڕوودەدا دەتبینی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) :**

**( ئەگەر یەکێ هەواڵی پرسیم بڵێ خەوتوە یان لە ماڵ نیە!! ).**

**پاشان شەکوای حاڵی خۆی دەکات و دەڵێت : بۆچی کوڕەکەم درۆ دەکات؟ ئەوە بەسایەی خۆتانەوەیە ئەی دایك و باوکی بەڕێز ، چونکە هەر لە مناڵیەوە لەسەر درۆ ڕامهێنراوە.**

## درۆکردن لە گاڵتەوگەپدا ..

**هەروەها لە جۆرەکانی ڕاستگۆیی:**

**ڕاستگۆیییە لە گاڵتەوگەپ و پێکەنیندا..**

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿ ویل للذی یحدث بالحدیث لیضحك به القوم فیکذب ویل له ویل له ﴾ .

ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: وەیل (تیاچون)بۆ ئەو کەسەی قسە باس دەکات تەنها بۆ ئەوەی خەڵکی پێبکەنن درۆی تیادەکات، وەیل بۆئەو پاشانیش وەیل بۆئەو.**

**پێغەمبەر (ﷺ) شۆخی کردوە و پێکەنیوە بەڵام ئەوەی ڕاست نەبوبێت نەی وتووە.. لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێ:**

﴿ انا زعیم ببیت فی وسط الجنة لمن ترك الکذب و إن کان مازحا ﴾.

ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: من دەبمە کەفیلی ماڵێك لەناوەڕاستی بەهەشتدا بۆ هەرکەسێك پشت لە درۆکردن بکات گەرچی بە سوعبەت وگاڵتەشەوە بێت .**

**پاکو بێگەردی بۆخوا!!**

﴿ زعيم﴾ واتە: زەمانەت ..کەفالەت .. پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ زەمانەتی ماڵێکت لە بەهەشتدا بۆ دەکات ئەگەر واز لە درۆ بهێنی لە گەڵتەکردنیشدا .
گاڵتەو شۆخی بکەو پێبکەنە تادەتوانی بەڵام درۆ مەکە .

## ئایا ئەمە درۆیە ؟!!

ئەمە کۆتاجۆرە لە ڕاستگۆیی زمان ، کە ڕاستگۆ بی لە بچوکترین شتدا.. ئەوەی کە خەڵکی پێی دەڵێن درۆی سپی !! هەندێك کەس دەبینی دەڵێن بۆچی ئەوەندە شتەکان قورس دەکەن ؟ ئەمە درۆی سپیە !.
کەسێك لە ئافرەتانی هاوەڵان چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ پێی فەرموو:
ئەی پێغەمبەری خوا جاری وا هەیە خواردنێك حەزم لێیەتی بەڵام دەڵێم حەزم لێی نیە ئایا ئەمە بە درۆ دەنوسریێ ؟
پیغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی :
﴿ إن الكذب يكتب كذباً حتى الكذيبة تكتب كذيبة ﴾.

ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: درۆ بەدرۆ تۆماردەکرێت، تەنانەت درۆکچکە کانیش بەگچکەیی لەسەرتان تۆمار دەکرێت !!**

## جۆری سێ هەم: ڕاستگۆیی کار..

خوای گەورە دەفەرموێت:

## ڕەوشتی باوەڕدار

﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا ﴾ الإسراء: ٨٠

**واتە: بڵێ پەروەردگارا یارمەتیم بدە تا هەرکاتێك دەستبەکاری هەرخێرێك بووم بەچاکی و راستی و دروستی ئەنجامی بدەم و لەهەرکارێك بومەوە و ئەنجاممدا سەرەنجامێکی چاکی هەبێت و بەجوانی لێی دەرچم و هەمیشە و بەردەوام لەلایەن خۆتەوە دەسەڵاتێکم پێ ببەخشە کە ببێتە هۆی سەرکەوتنی بەردەوامم.**

**سەیری دەستەواژە قورئانیەکان بکە ...**

**کاتێك ئەم ئایەتە دەخوێنیتەوە هەست دەکەی کە ڕاستگۆیی دایپۆشیوی ، تێربووی لە ڕاستگۆیی .. چونە ژورەوە و هاتنە دەرەوەم بە ڕاستگۆیانە بێت و درۆی تێدا نەبێت.**

## تاقی بکەرەوە و .. سەیری سەیرەکان دەبینی..

**ئەم ئایەتە بخوێنەرەوە و لێی تێ بگە تکایە ...**

**خوای گەورە دەفەرموێ :**

﴿ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا ﴾ الأحزاب: ٢٣

**واتە: مەردانێکی زۆر هەن لە ئیمانداران بەرامبەر ئەو پەیمانەی کە داویانە بەخوا ڕاستیان کرد ، لەسەری ژیان و پابەندبوون پێوەی و لایان نەدا لێی ، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێ کردو مرد لەسەری ، هەشیانە چاوەڕوانە ، بەهیچ شێوەیەك گۆڕان و لاری رووی تێ نەکردوون .**

**بیر لەم ئایەتە بکەرەوە ... جارێکی تر بیری لێ بکەرەوە و هەوڵبدە ... مانایەکی زۆر گرنگ ، سوێند بەخوا هەرشتێك بە ڕاستگۆیی لەخوا داوا بکەی بێ گومان پێت دەبەخشێت ، ڕاستگۆبە لەگەڵ خوا ... ئەوەی دەتەوێ دەستت دەکەوێ .**

## چەند نمونەیەك
## پێویستی بە جێبەجێکردن هەیە

## بەڕاستی ژیانێکی دور و درێژە..

﴿ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ﴾

ئەوە عومەیری کوڕی حومامە ... لە ڕۆژی جەنگی بەدردا هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و فەرمووی:

ئەی پێغەمبەری خوا : ئەگەر لەگەڵ ئەمانەدا بجەنگم وە بکوژرێم ئایا من لە بەهەشتدام ؟ فەرمووی بەڵێ ، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :

﴿ توموا الى جنة عرضها السماوت والأرض ﴾

واتە: هەستن بۆ بەهەشتێك پانتایی یەکەی ئاسمانەکان و زەویە .

عومەیر وتی: ﴿ بخ بخ ﴾ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

ئەی عومەیر مەبەستت لە ووشەی ﴿ بخ بخ ﴾ چیە ؟ عومەیر ووتی : هیوادارم من لە ئەهلی ئەو بەهەشتە بم..

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ ئەهلی ئەوێی. موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

لەدەستی عومەیردا چەند دەنکە خورمایەك هەبوو سەیری کردن و ووتی: ئەگەر نێوانی من و بەهەشت تەنها ئەم چەند خورمایە بێت ، بە ڕاستی ژیانێکی دوور و درێژە خورماکانی فڕێدار چووە ناو جەنگ و کوشتاری کرد تا شەهید بوو.

## ڕەوشتی باوەڕدار

ئایا حەزت لە بەهەشت نیە ؟ حەزت لە لیقای خوا نیە ؟ ئەی بۆ دەتبینم وەك عومەیر نیت لە ڕاستگۆییەکەیدا ؟ ڕاست بوو لەگەڵ خوا ، خواش بە ڕاستی لێی وەرگرت .

## سوێند بە خوا بۆ ئەمە شوێنت نەکەوتوم..

پیاوێك دوای ئەوەی بەشی خۆی لە غەنیمەتی جەنگی خەیبەر پێدرا چووە خزمەت پێغەمبەری خوا و فەرمووی:

ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەمە چیە ؟

ئەویش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەوە بەشی خۆتە لە دەستکەوتەکان..

پیاوەکەش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ، سوێند بێ من بۆ ئەمە شوێنی تۆ نەکەوتووم ، بەڵکو شوێنت کەوتووم بۆ تیرێك ئا لێرەدا — ئاماژەی بە سنگی کرد —بمپێکێ و بمرم و بچمە بەهەشت.

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سەیری کرد و فەرمووی:

( ئەگەر ڕاست بی لەگەڵ خوادا خواش ڕاستت بۆ دەنوسێ ).

دوای ئەوەی غەزایەك هاتە ئاراوە و پیاوەکە شەهید بوو ، تا ئێرە هیچ سەیرێکی تێدا نەبوو بەڵام سەیر لەوەدایە تیرەکە لەو جێگەیەی دابوو کە ئاماژەی پێ کرد . بردیانە خزمەت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەستی ئەم دیو ئەو دیو دەکرد و فەرمووی بەسەرسوڕمانەوە:

( ئەوەی ڕاست بێت لەگەڵ خوا خواش ڕاستی بۆ دەنوسێ ).

پاکو بێ گەردی بۆ خوا !! پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سەری سوڕما ئەی تۆ سەرت ناسوڕمێ .

## ووشەی نهێنی..

پێش ئەوەی دێڕەکان بەزمان بخوێنیتەوە داوات لێ دەکەم بەدڵ بیانخوێنیتەوە ..

دەتەوێ ببیتە بانگخوازی ڕێی خوا و دەستی خەڵکی بگری بۆ ناو ئیسلام ؟

ڕاست بە لەگەڵ خوا ، خوا بۆت ئاسان دەکات ، بەڵام فێربە و بخوێنەرەوە و خۆت ماندوکە ، سوێند بە خوا ئەوەی دەتەوێ ڕوو دەدات بە پشتیوانی خوای گەورە.

دەتەوێ ببیتە کەسێك کە شەونوێژ دەکات و دەگری لەترسی خوا ؟

ڕاست بە لەگەڵ خوا ، خوا یارمەتیت دەدات ، بەڵام بپاڕێرەوە و تێبکۆشە، دوورکەوەرەوە لە تاوان و هەوڵبدە بەو جۆرە دەبێت کە دەتەوێ .

دەتەوێ هاوسەرێکی چاك و پاك و لە خوا ترس بهێنی ؟

ڕاستبە لەگەڵ خوا بۆت ئاسان دەکات ، بەڵام چاوت بپارێزەو خۆت لە حەرام بەدوور بگرە ،ئەوەی دەتەوێ ڕوو دەدات .

دەتەوێ ڕۆڵەکەت صلاح الدین بێت ؟

داوات لێ دەکەم دوعاو پاڕانەوە ئەنجام بدەو بە باشی پەروەردەی بکە ئەوەی دەتەوێ ڕوو دەدات .

سوێند بە خوا ئەوە ووشەی نهێنی کاروبارەکانی ژیانە:

( ڕاست بە خوا ڕاستت بۆ دەکات و دەهێنێتە پێش ).

## ڕەوشتی باوەڕدار

### ئەچمە بەهەشت ...!؟

لە ڕۆژی جەنگی خەیبەردا بەندەیەکی حەبەشی دەموچاو ڕەشی بۆن ناخۆشی جل شڕ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ و ووتی :

ئەی پێغەمبەری خوا من بێ باوەڕ بووم لەگەڵ ئەم جولەکانە و ئێستە باوەڕم هێناوە ئەگەر بیان کوژم دەچمە بەهەشتەوە ؟

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : بەڵێ ..

ئەوجا ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ من دەم وچاوم ڕەشەو بۆنم ناخۆشە و جلوبەرگیشم شڕە ، ئایا دەچمە بەهەشتەوە ؟

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: بەڵێ .

ئیتر شەهید بوو ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:

هەڵی بگرن بۆ ناو خێمەکەم .. لەسەری وەستاو و فەرموی: ئیستە دەتبینم ، کە تۆ بۆنت ناخۆش بوو خوا بۆنخۆشی کردی ، تۆ ڕەش بووی خوا ڕووی سپی کردی ، ئیستە لە تەنیشتیەوە دوان لە( حور العین) دەبینم خۆڵی لەسەر لادەبەن و دەڵێن : خوا خۆڵ بکا بەوەی کە خۆڵاوی کردی ، خوا ئەوە بکوژی کە تۆی کوشت).

الله اکبر ... ئەمە چیە..؟ تەنها مەگەر بڵێین خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە ، بەڕاستی هیوایەکی گەورەی پێ بەخشین .

### ئەمە چۆن دەبێت ئەی کوڕی خەتتاب ؟

سەیری ڕاستگۆیی عومەری کوڕی خەتاب بکە ، دوعای کرد بە دوعایەك کە زۆر لە خەیاڵەوە نزیکە فەرمووی:

خوایه پلەی شەهیدیم لە وڵاتی پێغەمبەرەکەتدا بە نسیب بکەی !!.
ئەمە چۆن لەکاتێکدا مەدینە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامیە و شورای پۆلاییینەو ئەویش کێیە ؟
ئەمیری مسوڵمانانە ... بەڵام چونکە ڕاستگۆ بوو لەناو مەدینەدا شەهید بوو.

## چۆن پێبکەنم ...!؟

سەیری صەلاح الدینی ئەیوبی بکە . کاتێك پرسیاریان لێ کرد :
بۆچی پێ ناکەنی ؟ فەرمووی:
چۆن پێبکەنم لەکاتێکدا مزگەوتی( اقصى) دیلە ؟
نەیانبینی پێبکەنێ تەنها لە ڕۆژی ڕزگار کردنی مزگەوتی( اقصى )دا نەبێت .
ئەمڕۆش پیویستمان بەوەیە کە وەکو صلاح الدین ڕاستگۆ بین .

## دەترسم بەو جۆرە لێی تێ بگەی ؟!!

دەترسم وا تێ بگەی کە ڕاستگۆیان هەمیشە سەرەنجامیان مردن بووە ، بەڵام هەمیشە بەو جۆرە نەبووە ، بیر تانە ڕاستگۆیی علی کوڕی ابو تالب، دوعای دەکردوو دەیفەرموو:
(خوا شەهادەتم بە نسیب بکەی دوای تەمەنێکی درێژ لە پێناو تۆدا).
بەڵێ زۆر ژیاو بە شەهیدیش وەفاتی کرد .
ئیستە نیەتی ڕاست بێنە بەرامبەر خوا.

## پلەی ڕاستگۆیان بەرزترین پلەیە پاش پێغەمبەرێتی!!

**خوای گەورە دەفەرموێ :**

﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴾ النساء: ٦٩

**واتە: ئەوەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بکات ، جا ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبن کە خوا نازو نیعمەتی ڕژاندوە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان ، ئای ئەوانە کە هاوەڵ و هاوڕێ و هاودەمێکی چاك و بێوێنەن .**

**بینیت ؟ پێغەمبەران یەکەمینن و پاشان ڕاستگۆیان ناویان هاتووە!! ڕاستگۆیی پلەیەکە لە نێوان پێغەمبەرێتی و شەهیدی دایە .**

**پاکو بێگەردی بۆخوا !!**

**پلەی ڕاستگۆیی بەرزترە لە شەهیدی ... بەلاتەوە سەیر نەبێت ، لەبەر ئەوەی ناگەیتە پلەی شەهیدی هەتا ڕاستگۆ نەبی ... بەڵگەش ئەو بەندە ڕەشە حەبەشەییە کە باسمان کرد ، شەهادەتی بە نسیب بوو پاش یەك ڕۆژ لە مسوڵمان بوون لەبەر ئەوەی ڕاستگۆ بوو.**

## کەی درۆ ڕێگە پێ دراوە ؟

**لە سێ حاڵەتدا درۆ کردن ڕێگەی پێدراوە و بەس :**

**١- لە جەنگدا.**

**چونکە جەنگ فێڵ و تەڵەکەیە .**

**٢- لە چاکەخوازی نێوان خەڵکدا .**

دروسته که درۆ بکرێ له نێوان دوو کەسی بەشەڕهاتوودا بە یەکەم دەڵێیت بەڕاستی ئەو بەباشە باسی تۆی کردوە بەوەی تریش هەروا دەڵێیت.

برای خۆشەویستم ... ئاممان نیەتت لە بیر بێت !!

٣- درۆ بەرامبەر هاوسەر.

مەبەست لە درۆ لێرەدا ئەوە نیە کە خیانەت لە یەکتری بکەن و درۆ بکەن لەگەڵ یەك ، بەڵکو دەبێ ئەو درۆیە لە خزمەتی ڕەزامەندی و خۆشبەختی یەکتردا بێت ، بۆ نمونە بە خێزانەکەت دەڵێیت:

( تۆ لە هەموو شتێکی ئەم بونەوەرە جوانتری )

هونەر بەکاردەهێنی لە درۆدا لەم بوارەدا بەڵام نیەتت لەبیر بێ .

## ئیستە ڕاستگۆی تەواوی..

خۆشەویستان ئەمە ڕەوشتی ڕاستگۆیی بوو ... جا:

ئایا تۆ ڕاستگۆیی لەگەڵ خودا ؟

کوا ڕاستگۆییەکەت ؟ تەنها بە زمان مەیڵێ . بەڵکو نیەت و زمان و کردار.

ئەگەر ڕاستگۆبیت لە نیەتتداو ڕاستگۆ بی لە زمانتتدا و ڕاستگۆبی لە کارو کردەوەتدا ، ئەوا ڕاستگۆی تەواویت.

ئیستە زانیتان بۆچی ئەبوبکر ناو نراوە ڕاستگۆ ؟

لەبەر ئەوەی ڕاستگۆ بوو لە نیەت و زمان و کرداری دا.

## ئەمانەت ئەلف و بێی ئیسلامە ..

ڕەوشتی ئەمانەت ڕەوشتێکی بناغەییە لەئیسلامدا ، ڕەوشتێکە هەموومان دەیناسین ، بەڵام زۆربەی خەڵکی بەشێوەیەکی بەشبەش وکەم مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن ، بۆنمونە دەبینین دەڵێت :( من ئەمینم... دەست پان ناکەمەوە لەخەڵکی هەر کاتێکیش ئەمانەتێکم لەلا دابنێت وەك و خۆی دەیگێڕمەوە ... لەسەر ئەوە پەروەر دەبوم).

من لەمەدا جیاواز نیم لەگەڵتدا ، سوپاس بۆ خوا باش لەم مانایە تێدەگەیت،بەڵام لەڕاستیدا دەمەوێت ڕەوشتی ئەمانەت بەواتایەکی فراوانتر بخەمە ڕوو ، چونکە ئەمانەت زۆر لەوە فراوانترە کەئێمە لێی تێکەشتوین .

وەپێش ئەوەی دەست پێ بکەین دەمەوێت بزانیت کەمن نامەوێت شتەکانت لەلا ئاڵۆز بکەم ، یان پێت بڵێم : ئەمانەت فەرامۆش کراوە .. بەڵکو ئامانج ئەوەیە کە پێت بڵێم: چەندین جۆر ئەمانەت هەیە کە ئێمە کەم تەرخەمین بەرامبەریان ، بەڵکو هەر جێبەجێشی ناکەین .

ئەمە بانگەوازێکە بۆ گۆڕان بەرەو باشتر ، لەبواری ڕەوشتی ئەمانەتدا ئایا تۆ ئامادەیت ..!؟..

## نەکەی خیانەتکار بی بەرامبەر خوا و پێغەمبەرەکەی ..!!

**خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَخُونُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓا۟ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ الأنفال: ٢٧

**واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ، خیانەت مەکەن لەخواو پێغەمبەر(ﷺ) هەروەها خیانەتیش مەکەن لە ئەمانەت و سپاردەکان کە پێتان دەسپێردرێت ، لەکاتێکدا ئێوە دەزانن –ئەو کارە خیانەتە-.**

هەمومان دەزانین کەپێچەوانەی ئەمانەت خیانەتە ، وەهەموشمان ڕقمان لەخیانەتە و ئازارمان دەدات ، لەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕێگری دەکات لەوەی کەخیانەت بکەین بەرامبەری..

مانای خیانەت کردن لەخوا چیە؟

مانای: فەرمانەکانی واز لێ بهێنیت ... کەواتە فەرمانەکانی ئەمانەتێکن لەگەردنماندا.

هەروەها خوای گەورە ڕێگیری دەکات لەوەی کە خیانەت لە پێغەمبەر (ﷺ) بکەین.

خیانەت کردن لە پێغەمبەر (ﷺ) چیە ؟

واتە: ئێمە سوننەتەکانی فێربین بەڵام جێبەجێی نەکەین و بڵاوی نەکەینەوە لەناو خەڵکیدا و وازی لێ بهێنین .

پاکوبێ گەردی بۆخوا ... ئەمانەت شتێکی ئاسان نیە ... دەبینم تێبینی شتێکت کردوە ئەویش تەواو کاری ئایەتەکەیە:

﴿ وَتَخُونُوٓا۟ أَمَـٰنَـٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ .

یاالله ...!! ئەمە تەنها یەك ئەمانەت نیە ، بەڵکو چەندین ئەمانەت .

## خوای گەورە فەرمانمان پێ دەکات ئەمانەت بدەینەوە دەست خاوەنەکەی ...

من ئامۆژگاریت دەکەم ئەوەی کە قورئان دەخوێنێت سور بیت لەسەر ئەوەی کەتێی بگات ، وە بژی لەگەڵ ئایەتەکاندا ، کەواتە ئامادەبەو جێ بەجێی بکە .

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴾ النساء: ٥٨

داوات لێدەم بژی لەگەڵ ئەم وشانە ﴿ اللّه﴾ ﴿ يأمُرُكمْ﴾ ﴿ تؤدُّوا﴾ ﴿ الأمانات﴾ ﴿ أهْلِهَا﴾ .

پاکوبێ گەردی بۆخوا .. ئەوانە جێبەجێ بکە کە خوا فەرمانی پێداوە.

ئایا سەرنجی وشەی ﴿ أهْلِهَا﴾ ت داوە ؟ .

خاوەن ئەمانەت زۆرن کاتێك دەچینە کرۆکی باسەکەوە دەزانی کە کێن ئەو خاوەنانەی کە پێویستە ئەمانەتەکانیان بۆ بگێڕیتەوە .

ئێمە دەمانەوێ ڕزگارمان ببێت لەو مانا تەسکەی کە بۆ ئەمانەت کردومانە ، کە ئەویش ئەمانەتی شتێکی ماددیەیە !! وەبچینە ناو مانا فاوانەکەیەوە .

## چێژ لەم فەرمودەیە وەرگرە .. !!

وەرن با لەگەڵ فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)دا بژین کە سەبارەت بە ئەمانەت فەرمویەتی ، وەئەوەش بزانە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەمەککەدا پێش هاتنی وەحی بە ( ڕاستگۆی ئەمین ) ناسرابوو!!.

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ :

﴿ الصلوات الخمس ، والجمعة الى الجمعة ، وأداء الأمانة كفارة لما بينهما﴾.

موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

## ڕەوشتی باوەڕدار

واتە: پێنج فەرزەی نوێژ، جومعە بۆ جمعە، دانەوەی ئەمانەت پاکژکەرەوەی گوناهی نێوانیانە .

دەڵێی چی جێبەجێ کردنی ڕەوشتی ئەمانەت دەبێتەی هۆی سڕینەوەی گوناهەکان ، ئایا حەق نیە جێبەجێی بکەین و بیکەینە یەکێك لە خەسڵەتەکانمان ؟.

ئەمانەت بپارێزن ...

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

《 اضمنوا لي ستا من انفسكم أضمن لكم الجنة : اصدقوا إذا حدثتم. وأوفوا إذا عاهدتم . وأدوا إذا ائتمنتم . واحفظوا فروجكم . وغضوا ابصاركم . وكفوا أيديكم 》. ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردوە.

واتە: بنە کەفیلی شەش شت لەخۆتاندا من کەفیلی چونە بەهەشتان بۆ دەکەم:ڕاستگۆبن لەئاخاوتندا، بەوەفابن لەپەیمانەکانتاندا، داوێنتان بپارێزن، چاوەکانتان دابخەن (لەئاستی نامەحرەمدا) دەست درێژی مەکەن.

لەخۆت بپرسە پاش ئەوەی کە ئەم فەرمودەیە دەخوێنیتەوە ئایا چەند لەم شەشەت دەستەبەر کردوە ؟! ئەگەر ئەم شەش کارەت جێبەجێ کردبێ ئەوا خۆشەویستمان(ﷺ) لە بەهەشت دڵنیات دەکاتەوە دیارە کە یەکێك لە شەش کارەکە: ( ئەمانەت پارێزیە ).

وە سوێند بە خوا ئەم شەش کارە بە تێکەیشتنە گشتیەکەی کە هەمانە بۆ ئەمانەت هەمووی ئەمانەتە کەواتە گەر تۆ ئەمین بیت دڵنیا بە لە بەهەشتدای .

بەلاتەوە سەیرە ... دووردڵ مەبە ئەو سەرسوڕماوە پاش کەمێکی تر دەڕەوێتەوە .

## یاالله.. ئەمانەتی لیّ دادەڕنریّ..

**ئەم فەرموده زۆر توندە بخوێنەرەوە ...**

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویّ:**

﴿ إن الله إذا أراد أن يهلك عبداً نزع منه الحياء . فإذا نزع منه الحياء . لم تلقه إلا مقيتاً ممقتا . فإذا لم تلقه إلا مقيتاً ممقتا نزعت منهُ الأمانه . فإذا نزعت منهُ الأمانة لم تلقه إلا خائناً مخوناً . فإذا لم تلقه إلا خائناً مخوناً نزعت منهُ الرحمه. فإذا نزعت منه الرحمة لم تلقه إلا رجيما ملعنا . فإذا لم تلقهُ إلا رجيما ملعنا نزعت منه ربقة الأسلام ﴾.

ئیبن ماجە ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: گەر خوای گەورە بیەوێت کەسێك تیابەرێت (ڕیسوای بکات) شەرمی لێوەردەگرێتەوە، هەرکەسێکیش شەرمی لێوەرگیراوە تەنها بە نیگەرانی وڕوگرژییەوە دەیبینیت، گەر هەموکات بەنیگەرانی و ڕوگرژییەوە بینیت ئەمانەتیشی لێوەردەگیرێتەوە، هەرکات ئەمانەتیشی لێوەرگیراوە تەنها بە خیانەتکاری وخیانەتکەری(تۆمەتکردنی خەڵکی بەخیانەت)دەبینرێت، ئەوەیشی بەخیانەتکاری وخیانەتکەری بینرا ڕەحمەت وسۆزی لێهەڵدەگیرێت، گەر ڕەحمەتیشی لێوەرگیرا تەنها بە ڕەجمکراوی و نەفرینکار دەیبینیت، گەر تەنها بە ڕەجمکراوی ونەفرینکار دیتەوە بەبەردەوامی ئەوا ئیسلامەتی لەگەردندا دا دەماڵرێت .**

**هەستت بە قورسی ووشەکان کرد ؟ سەیرکە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ووشانەی بەکارهێناوە کە بۆ گوێچکە زۆر قورسن:**

**﴿ مقيتاً ممقتا ﴾ ﴿ خائناً مخوناً . ﴾ ﴿ رجيما ملعنا ﴾ زەنگی ئەم وشانە بۆ گوێچکە زۆر قورسن ، کە ئەمەش مەبەست پێی گرنگی باسەکەیە..**

**پاکو بیّ گەردی بۆ خوا ..**

## ڕەوشتی باوەڕدار

تۆ ئەمە دەبینی لە نێوانماندا ڕوو دەدات .. گەنجێك دەبینی شەرم ناكات لە كردەوەكانی وە هەست ناكات كە ئەو كەوتۆتە هەڵەوە ... خوا شەرمی لێ داڕنیوە .. سەیری ئەم زنجیرەیە بكە ، زنجیرەی لە ناوچون و فەوتان بە داڕنینی حەیا دەست پێ دەكات ، پاشان داڕنینی ئەمانەت ، ئەو كات دەبینی خیانەت لە خەڵكی دەكات ، دەبێتە مرۆڤێكی نا ئەمین ، مرۆڤێكی پەشۆكاوو شپرزە پاشان ئەوەی كە ئەمانەتی لێ دادەڕنرێ ڕەحمەتیشی لێ دادەڕنرێ ، ئەو كاتە دەبینی دەبێتە كەسێكی دڵڕەق...

تۆ ئەمە بە واقیعی دەبینی ، ڕۆژانە لە زانكۆ و پەیمانگاكان و ناوەنەكانی تری خوێندندا شتی لەم جۆرە ڕوو دەدات ، ئاممان خوشك و برای خۆشەویست نەكەی بكەویتە ناو ئەم زنجیرەیەوە چونكە ئەوە زنجیرەی لەناوچونە ..

## ئەوانەی كارو كۆشش دەكەن با بۆ ئەم دەسكەوتانە بیكەن..

**پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەی( شەفاعەت )دا ، دەفەرموێ:**

《 ثم يمر الناس على الصراط نيرسل الله تبارك و تعالى على جنبتي الصراط الأمانة والرحم . نتقومان نكلما اراو احد أن يجتاز الصراط تسأله الأمانة : أأويت ما عليك من حقي ؟! 》 .موسلیم ڕیوایەتی كردوە.

**واتە: ئەوجا خەڵكی بەسەر سیراتدا دەڕۆن، خوای گەورەش لەڕاست وچەپی سیراتدا (ڕێگەی قیامەت )ئەمانەت و ڕەحم وسۆز داناوە، هەردوكیان هەڵدەسن هەركاتێك یەكێك بیەوێت بەسیراتدا تێپەڕێت ئەمانەت پێی دەڵێت : ئایا مافەكانی منت جێبەجێكردوە ؟**

بیر لەمە دەکەیتەوە ! ئەمانەت و سیلەی ڕەحم کۆتا دوو شتن کە پرسیاریان دەربارە دەکرێ لە کاتێکدا تۆ لەسەر پردی سیراتی ... سوێندت دەدەم بە خوا خیانەتکار مەبە و ئەمین بە ... چونکە ئەو حاڵە لەو ڕۆژەدا زۆر قورسە ...

﴿ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ ﴾. الصافات ٦١

**واتە: ئەوانەی کە کار و کۆشش دەکەن دەبا بۆ ئەم دەستکەوتانە بیکەن.**

## دووڕوویی ڕەوشت..

**پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:**

﴿ آية المنافق ثلاث : إذا حدث كذب . وإذا وعد اخلف . وإذا ائتمن خان ﴾.

بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: نیشانەی دوڕویی سیانە: کاتێك قسەی کرد درۆ دەکات، گەر پەیمانیدا دەیشکێنێ، گەر ئەمانەتی لادانرا خیانەتی لێدەکات.**

**وە لە ڕیوایەتێکی تردا کە موسلم ڕیوایەتی کردووە دەفەرموێ:**

﴿ وإن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق ، و من كان فيه الثلاثة كان منافقا خالصا ﴾. موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هەریەکێك لەو سیفەتانەی تیابو ئەوە سیفەتێکی دوڕویی تیایە، هەرکەسێك هەرسێ سیفاتەکانی تێدابو ئەوا بەتەواوەتی دوڕوە.**

**لێرەدا مەبەستمان لە دووڕویی عەقیدەیی نیە ، بەڵکو دووڕویی لە جۆرێکی تر ، کە ئەویش دووڕویی ڕەوشتە ، هەندێك جاریش ئەم جۆرە قورسترە لە جۆرەکەی تر ...**

**پاکو بێ گەردی بۆ خوا بڕوانە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ نافەرموێ ئەوەی کە واز لە نوێژ دەهێنێ لەوانە بەڵکو دەفەرموێ :**

## ڕەوشتی باوەڕدار

**نیشانەکانی دوو ڕوو:**

**١- ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات .**

**٢- ئەگەر بەڵێنیدا لێی لادەدا .**

**٣- ئەگەر ئەمانەتی لا دانرا خیانەتی لێ دەکات .**

**ئەی خوشك و برای خۆشەویست:**

**هەر کەس یەکێك لەم سێ سیفەتانەی تیا بێت واتە سیفەتێکی دووڕوی تیایە هەتا وازی لێ دەهێنێ ... هەموو ئەمانە لە خۆت دوور بخەرەوە ... ئایا پاش هەموو ئەمانە دەتەوێ خیانەت بکەیت ...!؟.**

**دەی خێرا ئەم سیفەتانە فڕێ بدە ... هەتا باوەڕدارێکی پاك و ساغ بیت.**

## باوەڕی نیە ئەوەی کە ئەمانەتی نەبێ..

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿ لا ایمان لمن لا امانة له ﴾

**واتە: ئیمانی نییە هەکەسێك ئەمانەتی لا پارێزراو نەبێـت.**

**بەڕاستی فەرموودەیەکی قورسە ، وا پێ دەچێ فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەمانەت زۆر توند بن ... بە ڕاستی باسەکە خەتەرناکە ..**

**﴿ لاایمان ﴾ واتای چیە ؟ ئایا مەبەست ئەوەیە کە ئەو کەسە تەواو لە بازنەی باوەڕ چۆتە دەرەوە ؟ نەخێر ... بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە باوەڕی تەواو نیە ... کەواتە هەر کەس خیانەت کار بێت باوەڕی تەواو**

ئ‌ی‌یه جا چه‌نده گه‌ردن که‌چ بێت له نوێژه‌کانیدا ، هه‌ر چه‌نده حه‌جیشی کردبێت ، مادام خیانه‌تکاره باوه‌ڕی ته‌واو نیه .

## ئه‌مانه‌ت به‌ش به‌ش ناکرێ..

پێغه‌مبه‌ر ﴿ﷺ﴾ ده‌فه‌رموێ:

﴿ أد الأمانة إلى من ائتمنك و لا تخون من خانك ﴾. ئه‌بوداوود ڕیوایه‌تی کردوه.

واته: هه‌رکه‌س ئه‌مانه‌تی لادانایت بیده‌ره‌وه، ئه‌وه‌یشی فێڵ وخیانه‌تی لێکردی تۆ فێڵو خیانه‌تی لێمه‌که .

پاکوبێ گه‌ردی بۆ خوا ...!! ئه‌مانه‌ت به‌ش به‌ش ناکرێ ، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر که‌سێك خیانه‌تیشت لێ بکات تۆ نابێ خیانه‌تی لێ بکه‌یت ...!!

سه‌یری پێغه‌مبه‌ر﴿ﷺ﴾ بکه له‌کاتی کۆچدا:

هه‌موو ئه‌مانه‌ته‌کانی گه‌ڕانده‌وه بۆ خاوه‌نه‌کانیان له کاتێکادا ماڵ و سامانی هه‌موو موسوڵمانان به تالان برا بوو ، به‌ڵام نه‌یفه‌رموو ئه‌مانه له بری ئه‌وانه..

به‌ڵام له جه‌نگی به‌دردا چونه ده‌ره‌وه بۆده‌ستبه‌سه‌ردا گرتنی قافڵه‌یه‌ك به‌رامبه‌ر ئه‌و سه‌روه‌ت و سامانانه ، ئێمه هه‌رگیز نابێ فێڵ و ته‌ڵه‌که‌مان هه‌بێت .

به‌ڕاستی ئه‌مانه‌ت به‌ش به‌ش ناکرێت ... ئه‌وه واتایه‌کی گرنگه و پێویستی به‌تێگه‌یشتنێکی ورد هه‌یه ..

کاتێك ئه‌مانه‌ت لای هاوڕێیه‌کت دائه‌نێیت و و خیانه‌تی لێ ده‌کا ، ئامان نه‌که‌یت کاتێك شتێکت هاته به‌رده‌ست تۆش وه‌ك ئه‌و بکه‌ی.

﴿ أد الأمانة إلى من ائتمنك ولا تخن من خانك ﴾.

## ڕەوشتی باوەڕدار

## بە چوار شت دونیام دەست دەکەوێ..

**پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:**

﴿ أربع مَن كن فيه فلا عليك ما فاتك من الدنيا : حفظ أمانة . وصدق حديث . و حُسن خليقة . وعفاف في طُعمة ﴾ .

**واتە: چوارشت هەن هەرکەس تیایدابێت باکت نەبێت هەرچیەکت لەدونیادا لەدەست چوە: پاراستنی ئەمانەت و راستی لە ئاخاوتندا و ڕەوشت جوانی و پاکیزەبون لەنیگەرانییەکاندا .**

**هەر کەسێك یەکێك لەمانەی تیابێت ئەوا دونیای دەستکەوتوە ، لەبەر ئەوە با غەمبار نەبێ بەوەی کە شتێکی لەدەست چووە . غەمبار مەبە بەوەی کە پارەت لە دەستچووە یان پلەو پایەو ... هتد**

**دەبینم تامەزرۆی بۆ لەبەرکردنی ئەم چوارە ... دەی خێرا ئەمین بە ڕاستگۆ بە ڕەوشت جوان و پاك بە ...**

**وە ماڵئاوایی لە دڵە ڕاوکێ و خەم و خەمۆکی بکە.**

## ئایا پێم ڕاگەیاندن ؟..

**لە وتاری ماڵئاوایدا ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە کۆتاییەکەیدا فەرمووی:**

**ئەی خەڵکینە: ئەوەی کە کەسێك ئەمانەتی کەسێ لایە با بیگەڕێنێتەوە بۆی .. پاشان فەرمووی : ئایا گەیاندم ؟ ئایا گەیاندم ؟ ئایا گەیاندم ؟ .. بائەوەی ئامادەیە بیگەێنێ بەوەی کە لێرە نیە ...**

**ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.**

خۆشەویستان ..
پیغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەگەڵ تۆیەتی ، چاوێك بە ماڵەکەتدا بگێڕە ، ئەمانەتی زۆرمان لا کۆبۆتەوە ، وە ئەمانگێڕاوەتەوە ، کەمتەرخەمیمان کردوە ، دەبینم دوای خوێندنەوەی ئەم باسە وەرەقەو قەڵەمێك بەدەستەوە دەگریت و گەورەو بچوکی ئەو ئەمانەتانەی کە لاتە دەی نوسیت ... وانیە ؟... بەڵێ ... ئینشاالله .
بزانە تەمەن چەند ساتێکە ... لە یادت بێت و لە پێغەمبەری خواوە پێت گەیشتوە .

## ئەگەر ئەمانەت وێڵ کرا چاوەڕوانی قیامەت بە..

پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾و ووتی :
ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کەی قیامەتە ؟
پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:
( ئەگەر ئەمانەت وێڵ کرا چاوەڕوانی قیامەت بە ).
پیاوەکە ووتی:
ئایا وێڵکردنی کامەیە ؟.
پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:
( ئەگەر کار درایە کەسی نەشیاو ئەوا چاوەڕوانی قیامەت بە ).
بوخاری ڕیوایەتی کردوە.
یاالله..!! وەستانی ئاسمانەکان و زەوی وابەستەیە بە ئەمانەتەوە ، وەك بڵێی ئەمانەتیش سوننەتێکی بونەوەرە وەك خۆر و مانگ ... هەر

**کاتێك خۆر و مانگ ون بوون ئەوا قیامەتە ، هەروەها ئەگەر ئەمانەتیش پارێزگاری لێ نەکرا قیامەت هەڵدەستێ .**

**بەڵام نابینی چۆن ئەمانەت وێڵ دەکرێ ؟ کاتێك کار بدەیتە کەسی ناشیاو ، دەبینی بەرپرسی کارێك شایستەی ئەو بەرپرسیاریەتیە نیە ، یان شیاوی ئەو کارە گەورەیە نیە.**

**سوێند بەخوا باسەکە گەورەیە ، ئایە ئێستە هەست بەوە ناکەی کە بەخیانەت کردنت لە ئەمانەت قیامەت نزیك دەبێتەوە !!؟.**

# جۆرەکانی ئەمانەت

## یەکەم : ئەمانەتی پارەو کەلوپەل..

**ئێستە جۆرەکانی ئەمانەت دەزانیت ، وە ئامۆژگاریت دەکەم کە لە بەرامبەر ئەو جۆرانەدا خۆت پێوانە بکەیت ، ئەگەر باش دەرچویت سوپاسی خوای لەسەر بکە ، گەر پێچەوانەی ئەمەشت بینی ئەوا بەخۆتدا بچۆرەوە باوەڕت نوێ بکەرەوە ، لە گەڵمدا لە خوای ڕێنموکار بپاڕێرەوە ،لە وەڵامیش دڵنیابە ئەو وەختە ئەمین دەبی بەویستی خوا .**

**بەناوبانگترین جۆرەکانی ئەمانەت و ئەوەی زۆر بڵاوە لەناوماندا ئەمانەتی پارەو کەلوپەلە..**

**پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:**

﴿ المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده ﴾ .بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: موسڵمان ئەوکەسەیە موسڵمانان لەزوبان ودەستەکانی بێوەی بن .**

﴿ و المؤمن من امنه الناس على دمائهم وا موالهم ﴾. ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

واتە: باوەڕدار ئەوکەسەیە خەڵکی بەئەمینداری بزانن لەسەر خوێن وماڵ و سامانەکانیان .

باوەڕدار ..!!

پاکو بێگەردی بۆخوا ... باوەڕدار ئەوەیە کە خەڵك دەیکاتە ئەمینداری پارە و سامان ، وە پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەوەی نەکردوە کە باوەڕدار ئەوەیە کە زۆر بگری لەشەونوێژدا ، باسی باوەڕداری ئافرەتی نەکردوە بەوەی کە وابەستەی بالاپۆشی بێ و ..... من مەبەستم لێرەدا ئەوە نىیە کە گریان لە ترسی خوا و بالاپۆشی گرنگ نین..نەخێر ، بەڵکو ئەمانە لە تەواوکاریەکانی باوەڕن ، بەڵام مەبەستم ئەوەیە کە بالاپۆشی کۆتایی ڕێگەکە نىیە ، تەنها ئەوە هەموو داوەکاریەکە نیە..

گەر دەتەوێ بزانیت باوەڕداری یان نا ... لە خۆت بپرسە ئایا خەڵك بە ئەمینت دەزانێت یان نا ... گەر بە ئەمینیان زانیت و ئەمانەتیان لا دانای، ئەوا تۆ باوەڕداریت .

پاکو بێ گەردی بۆ خوا .. بەڕاستی ئەم پێوەرە جۆرێکە هەرگیز هەڵە ناکات ، کەواتە با خۆمانی پێ بپێوین .

سەیری پێغەمبەر (ﷺ) بکە چۆن سور بووە لەسەر ئەوەی کە لەکاتی هیجرەتدا ئەمانەتەکان بگێڕێتەوە ، بۆیە داوای لە علی کوڕی ئەبو تالب کرد کە بمێنێتەوە و فەرمووی:عەلی تۆ بمێنەرەوەو دوای من ئەمانەتکانی خەڵکی بگێڕەرەوە و پاشان وەرە!!.

پاکو بێگەردی بۆ خوا ... ئەوان دەیانەوێ بیکوژن بەڵام ئەم سورە لە سەر گێڕانەوەی کەل و پەلەکانیان... ئایا تۆ دەتوانی بەو جۆرە بیت !؟.

## ئەمانەتە لە یادچوەکان..

پارێزگاری کردن لە ئەمانەتە گەورەکان کارێکی ئاسانە ، بەڵام ئەمانەتێکی تر هەیە بچوکەو زۆر جار لە یادمان دەچێت وەك :

شریتی کاسێت : دەتبینم پێدەکەنی ، چەندن ئەو کاسێتانەی کە وەرت گرتوە تاکو ئێستا نەتگێڕاونەتەوە بۆ خاوەنەکەی و بەڵکو داوتە بە خەڵکانی تریش ..وانیە ؟.

یاخود ئەو ملوانکەیەی کە لە هاوڕێکەتت وەرگرتوە ... ئەوە بۆ چەند مانگێك دەچێت ، ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە کە بیگەڕێنیتەوە بۆی ؟ یان دەڵێی خۆ ئەویش شتی زۆری لەمن وەرگرتوە ؟ لە بیرت بێت . خیانەت لەو کەسە نەکەی کە خیانەتت لێ دەکات ﴿ ولا تخن من خانك ﴾.

هەروەها کتێبێك کە وەرتگرتوە تاکو ئێستە نەتگەڕاندۆتەوە بۆ خاوەنەکەی ، چەند کتێب هەیە لەلات و موڵکی تۆ نین ... ئەوانە ئەمانەتن لە یادت بێت ..!!.

یان ئەو مەلزەمەیەی کاتێك کە وەرت گرت تەنها مۆڵەتی یەك هەفتەت هەبوو کەچی ئەوە چەند مانگێکە لەلاتە .

ئەمانەو چەندینی تر لە ئەمانەتە لە یادچوەکان ... من نایانژمێرم ... چونکە لە ژمارە نایەن و خۆت لە من باشتر دەزانی.

بەڵام پێت دەڵێم :

ئایا پێت خۆشە بەخوا بگەیت و هەموو ئەم ئەمانەتانەت لە گەردندا بێت؟.

بەڕێزان : سوربن لەسەر گێڕانەوەی ئەمانەتەکان و ئەوەش بزانە کە ئەمانەتی گەورەو بچوك بونی نىيە ، بەڵکو ئەمانەت هەرچی و هەر چۆنێك بێت ، ئەمانەتە ...

## دووهەم : ئەمانەتی کڕین و فرۆشتن..

هەروەها لە جۆرەکانی ئەمانەت : ئەمانەتی کڕین و فرۆشتنە ، وە ئەمانەتی ئەو پیشەیەیە کە کاری تیادا دەکەین .
پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ :
﴿ التاجر الصدوق الأمين مع النبيين والصدقين و الشهداء ﴾. موسليم ريوايەتی کردو
**واتە: تاجرو کاسبکاری ڕاستگۆ لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدەکانن .**
بانگەوازێك بۆ سەرجەمی ئەو بازرگانانەی کە باوەڕیان بە خوا هەیە :
بە ڕاستگۆیی و ئەمینی لەگەڵ پیغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان دا دەبیت .

جا کاتێك پزیشك نەخۆشەکە ئاڕاستەی پزیشکێکی تر دەکات بۆ شۆخی کردن و بەبێ ئەوەی نەخۆشەکە پێویستی پێی بێت و واشنازانێت بەم کارەی گوناهێکی ئەنجام دابێت ، سوێند بەخوا ئەوە خیانەتە لە ئەمانەت .

ئەو میکانیکیەی کە وات لێ دەکات چەندین هەزاردینار سەرف بکەیت بۆ پارچەکانی سەیارەکەت لەکاتێکدا پێویستیشی نیە و وا دەزانێ کە هیچ تاوانێکی ئەنجام نەداوە ... سوێند بە خوا ئەمە خیانەتە لە ئەمانەت ، چونکە ئەوەی ئەو دەیزانێ تۆ نایزانیت و ئەویش خیانەتت لێ دەکات .

### ڕەوشتی باوەڕدار

زۆر شتی تریش هەیە ... هەموو خاوەن پیشەیەك شتی لەلا دادەنرێ ... سوێند بە خوا ئەو شتانە ئەمانەتێکی گەورەن ... ئەوەش کە ئاگای لێیەتی خوایە ... لەبەر ئەوە لە خوا بترسن لە ئەمانەتانەدا.

## ئەمانەت هۆکاری بڵاوبونەوەی ئیسلام بوو لە ئاسیادا..

لەو شتانەی کە وات لێ دەکات زیاتر فەخر و شانازی بکەیت بە ئیسلامەوە ئەوەیە کە لە زۆرێك لە وڵاتاندا بەهۆی ڕەوشتەوە بڵاو بۆتەوە، وە بەتایبەتی ڕەوشتی ئەمانەت . نەك بە زەبری شمشێر وەك هەندێك دەڵێن..

ئیسلام لە ئاسیادا لە ڕێگەی ڕەوشتی ئەمانەتەوە بڵاو بوەوە ، بازرگانی مسوڵمانی ڕاستگۆ دەچونە ئەو وڵاتەو شتیان لێ دەکرین ، پاشان بە ئەمانەتەوە دەیان فرۆشت ، لە کاتی فرۆشتنیاندا هەموو باشی و خراپی و کەم و کوڕیەکانیان باس دەکرد و هیچیان لە کڕیار نەدەشاردەوە ، کاتێك دەربارەی دینەکەیان پرسیاریان لێ دەکرا بەوپەڕی شانازییەوە دەیان گوت ئیسلام دینمانە ، ئەو کات شایەتیان دەداو مسوڵمان دەبوون.

پاکو بێ گەردی بۆ خوا ...

خەڵك دێنە ناو دینی خواوە بە هۆی ئەمانەتی ئێمەوە ... ئەوە چیمان بەسەر هاتووە ...!؟ بەئاگا بێنەوە مسوڵمانان ... خوو بەم ڕەوشتە بەرزەوە بگرن ... ئایا حەز ناکەن بگەڕێینەوە سەر ئەو حاڵەتەی کە جاران لە سەری بووین !؟.

## سێهەم : ئەمانەتی پاراستنی نهێنیەکان..

هەروەها لە جۆرەکانی ئەمانەت ... ئەمانەتی پاراستنی نهێنیەکانە.
وە داواکارین لە ئافرەتان کە لەم جۆرەیاندا ئارامگر بن لەگەڵماندا !!
چونکە زۆر تر پەیوەندی بە ئەوانەوە هەیە !!
پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:
《 إذا حدث الرجل بالحديث ثم التفت فهي أمانة 》. ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە .
واتە: گەر کەسێك وتەیەکی وتو سەیری لای ڕاستو چەپی کرد ( بۆئەوەی کەس پێی نەزانێت ) ئەوا ئەو قسەیەی ئەمانەتە .
حەقی خۆتە ئەم فەرمودەیە سێجار بخوێنیتەوە !!
ئایا واتای ئەم فەرمودەیە چیە ...!؟
واتە : گەر دوو کەس قسەیان دەکرد ، یەکێکیان سەیری ڕاست و چەپی خۆی کرد تا دڵنیا بێت لەوەی کە کەس گوێی لە قسەکەیان نیە ، بە تەنها ئەم جوڵەیە وا لەم قسەیە دەکات کە ئەمانەت بێت .
واتە ئەم قسەیە نهێنیە وە پێویست ناکات کە ئەو کەسە بەزمان بڵێت ئەمە نهێنیە ..!!.
ئیتر لەسەر ئەمە پێوانە بکە ... نزم کردنەوەی دەنگ لەکاتی قسەدا ؟
کەواتە ئەم قسانە ئەمانەتەو نهێنیە ، ئیتر بە ئاماژە تێ بگە ..!!
بەڵام کەسانێك هەن نهێنیەکان ناپارێزن و دەڵێن: تۆ پێت نەوتوم ئەمە نهێنیە !! پێت نەوتم ئەمە ئەمانەتە !! ئەگەر وات پێ بوتمایە منیش ئاشکرام نەدەکرد ..!!.
ئێستە زانیت بۆچی ووتم : داواکارم ئافرەتان زیاتر ئارام بگرن لە سەرمان چونکە ئەوان زیاتر لەم بوارەدا ڕۆڵیان هەیە ...!!.

## بیهێنە پێش چاوت ... لە گەورەترین ئەمانەتەکان..

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ :

«إن من أعظم الأمانات عند الله يوم القيامة أن تفضي الرجل لامرأته بالحديث ، وتفضي إليه ثم ينشر سرها » .موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: لە گەورە ترین ئەمانەتەکان لای خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا ئەوەیە پیاو قسەی تایبەت بۆخێزانەکەی بکات و ژنیش بچێتە لای ، دواتر پیاو نهێنیەکەی ئاشکرابکات !!**

ئای ئەمە چ فەرمودەیەکە بۆ هاوسەران ... فەرمودەیەکی توند ... لە دڵدا جێ دەگرێ ... وانیە ؟.

یاالله ... لە گەورەترین ئەمانەتەکان ئەمەیە ... گەورەتر لە پارە ... چەند کەس لەکاتی تەڵاقدا ڕاستیەکان دەردەخات ... !!

دەبینی دەڵێت : تۆ وات دەکردو وات دەکرد ، هیچ نهێنیەك ناپارێزێت ، هەروەها ئەویش بەهەمان شێوە ... خوایە پەنا دەگرین بە تۆ ... نەك تەنها لەکاتی تەڵاقیشدا بەڵکو لەکاتی کێشەشدا شتی وا ڕوو دەدات ، وانیە ؟

داواکارم لە خوای گەورە بە دورمان بگرێ لەم جۆرانە .

توێژێکی تریش هەیە . خوا پەنامان بدات . ئەم جۆرە نهێنیەکان ئاشکرا دەکەن بەبێ ئەوەی لەحاڵەتی تەڵاق یان کێشە دابێت ، دەبینی هەرچی لەنێوان خۆیی و مێردەکەیدا ڕوو دەدات لەسەرەتاوە تا کۆتایی بۆی دەگێڕێتەوە ، ئایا لە بیریان چووە کە لەبەردەمی خوای گەورەدا دەوەستن؟.

ئەمە لەگەورەترین ئەمانەتەکانە لە ڕۆژی قیامەتدا..ئێستە زانیتان هۆکاری ناارامی خێزان چیە ... !؟ .

## چوارەم : ئەمانەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئافرەتدا..

جۆری چوارەم لە جۆرەکانی ئەمانەت ، ئەمانەتی مامەڵەکردنە لەگەڵ ئافرەتدا..

هیوادارم بە هەڵە لێم تێنەگەن ، بۆ ئەوەش زۆر بیر نەکەیتەوە ئەم نمونەیە تێ بگە کە بەڕاستی نمونەیەکی گەورەیە خوای گەورە لە قورئاندا و لە سورەتی (القصص)دا ئاماژەی پێ کردوە تاکوو لێوەی فێربین ..ئەمە بەرزترین نمونەیە لە ئەمانەتدا لە جۆری مامەڵە کردن لەگەڵ ئافرەتدا ...

﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِۖ قَالَ مَا خَطْبُكُمَاۖ قَالَتَا لَا نَسْقِى حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُۖ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّى لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَىَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِى عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِى يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَاۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْۖ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴾ القصص: ٢٣ - ٢٦

واتە: کاتێك گەیشتە ئاوەکەی مەدیەن خەڵکێکی بینی ماڵاتەکانیان ئاودەدا لەلاشەوە دوو ئافرەتی بینی کەبەخۆیان و مەڕەکانیانەوە دوورەپەرێز وەستابوون ، بۆیە لێیان چووە پێشەوە و پرسی و ووتی : ئەوە ئێوە بۆچی لێرە وەستاون ؟ کێشەتان چیە وا دوورە پەرێزن ؟ ئافرەتەکان ووتیان : ئێمە ناتوانین ماڵاتەکانمان ئاو بدەین هەتا شوانەکان نەڕۆن ، باوکیشمان پیرێکی بەساڵاچوە ... موسا مەردانە شوانەکانی بردا و ماڵاتەکانی ئاودا و بەڕێی کردن ، دوایی پشتی تێ

## ڕەوشتی باوەڕدار

کدرن و چوە ژێر سێبەرەکە و نزای کردو ووتی : پەروەردگارا بەڕاستی ت ۆخێرو بیرێ زۆرت بەسەردا رژاندووم بەلام هەر هەژارم و ئاتاجی بەخششی زیاترم ... دوای تاوێك یەکێك لە کچەکان هات بۆلای موسا زۆر بەشەرم و حەیاوە دەڕۆیشت بەرێگەدا ، کەگەیشتە لای پێی ووت: باوکم بانگت دەکات و حەزدەکات پاداشتی ئەو چاکە و ئاودانی مالاتەکە بۆ ئێمەت ئەنجامدا بداتەوە ، کاتێك موسا گەیشتە لای باوکیان و دوای حەوانەوە هەموو بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێرایەوە ، باوکی کچەکان ووتی : مەترسە تۆ ئیتر رزگارت بوو لەدەست قەومی ستەمکار ... یەکێك لە کچەکان ووتی : بابە بۆ بەکرێی ناگریت چونکە بەڕاستی چاکترین کەسێك کە تۆ بیگریت بە کرێ ئەم پیاوە بەهێز و ئەمین و دەستپاك و دەروون پاکەیە .

لە گەورەمان موساوە فێر ببە ... ئەو دوو ئافرەتە ناتوانن ئاوی مەڕو مالاتەکەیان بدەن لەبەر قەرەبالغی ، ئایا گەورەمان موسی دەلێت : (ئەمە چ پەیوەندیەکی بە منەوە هەیە) ؟ ئایا دەلێت:( من قسە لەگەل ئافرەتدا ناکەم)؟.

پاکو بێگەردی بۆ خوا !! گەنجانێك هەن پێیان وایە کە مامەلەکردن لەگەل ئافرەتدا حەرامە بە هەموو جۆرێك ! کێ وای ووتوە ؟ گەورەمان موسی خۆی چو بۆ لایان و فەرمووی : ئەوە ئێوە چیتانەو کێشەتان چیە ؟ ... ئەمە ئەدەبی ئیسلامە . نەی فەرموو : ئێوارەتان باش ، من ناوم ... !!

لەهەمان کاتیشدا ئافرەتەکانیش ، سەیری ئەدەب و ڕێزیان بکەن ... وەلامەکەیان بە ئەندازەی پرسیارەکە بوو ... خۆ ئەگەر باوکیان پیاوێکی بە تەمەن نەبوایە ئەوا ئەمان نەدەهاتنە دەرەوە بۆ ئەم کارە ،

پاشان دەرەنجامەکەشی(تَسَتَّی لَهُمَا) ئەمەش بەو پەڕی ڕێکی لە مامەڵە کردن لەگەڵ ئافرەتدا ...

جا ئەم دیمەنە پڕ لە جۆش و خرۆشە بهێنە پێش چاوی خۆت ، پاش ئەوەی کارەکەی بۆ تەواو کردن چوە سێبەرێك ، بڕوانە حەیای ئەم پیاوە مەزنە ، نەی فەرموو : من هەموو ڕۆژێك لەم کاتەدا لێرە دەبم !! ئەتبینم پیّ دەکەنی ... !! برای بەڕێزم لە ئەدەبی گەورەمان موسیەوە فێربیە ، لەبەر ئەوە زۆر سەیرە کە ئەم ئافرەتە بە باوکی دەڵێت :

(إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِيُّ ٱلْأَمِينُ) .

چۆن زانیت کە ئەم پیاوە ئەمینە ... !؟ بەلاتەوە سەیر نەبێت ... ئافرەت بە سەیرکردنی چاو پیاو دەناسێت ... !

ئێمە زۆر پێویستیمان بەوە هەیە کەنمونەی گەورەمان موسی لە مامەڵە کردنیدا لەگەڵ ئافرەت بەهەند وەربگرین و قسەی زیاتری لەسەر بکەین ، چونکە زۆرێك لە گەنجان هەن مەبەستیان باش نیە لە مامەڵەکردنیاندا لەگەڵ ئافرەت و وەجۆرێکی تریش بەهەموو جۆرێك مامەڵە کردن ڕەت دەکەنەوە و لە فەرهەنگیدا ووشەی ئافرەت بونی نیە ..!!.

برا خۆشەویستەکەم ... تکات لیّ دەکەم مەبەستی قسەکانم تیّ بگە ... لە ناوەڕۆك و جەوهەری باسەکان حاڵی بە ، نەك ڕوکاری قسەکان وەرگری...!!.

## ژن ئەمانەتە لە گەردنتدا..!!

هەندێك وا گومان دەبەن كاتێك ئافرەتێك دەكەنە هاوسەری خۆیان ئیتر بۆتە موڵكیان !! وا دەزانن بە داخوازیان دەبنە ژێر دەستەی ئەوان و دەتوانێ چی بوێت و چۆنی بوێت وای لەگەڵدا بكات !! ئەمەش تێگەیشتنێكی هەڵەیە ... ژنەكەت ئەمانەتە لەگەردنتدا ، وە لە ڕۆژی دوایی‌دا كاتێك لەبەردەمی خوای گەورەدای پرسیارت لێ دەكرێ دەربارەی ئەم ئەمانەتە ، ئایا بیرت چوو كاتێك ئیمزات كرد لەسەر بەڵێننامەی هاوسەرگیری ئەو ئیمزایەت لەبەرامبەر ئەمینی بوو بۆ هاوسەرەكەت؟.

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴾ النساء: ٢١

**واتە: جا چۆن دروستە مارەییان لێ وەربگرنەوە لەكاتێكدا ئێوە چونەتە لای یەكترو ژنانیش پەیمان و بەڵێنێكی گەورە و گرنگیان لێ وەرگرتوون —لەكاتی مارەكردنیاندا-.**

پەیماننامەی هاوسەرداری تاكە پەیماننامەیەكە خوا بەگەورە باسی كردوە ، ووشەی ﴿ غَلِيظًا ﴾ بەڕاستی زۆر بەهێزو و توندە ... ئایا هەستت پێ كردوە !!؟.

ئایا بیرت لەوە كردۆتەوە كاتێك كە ڕێگری ژنەكەت دەكەیت لەوەی كە سەردانی ماڵی كەس و كاری بكات تۆ خیانەتت لە ئەمانەت كردوە !!؟

لە بیرتە كاتێك دەستت خستە ناو دەستی باوكیەوە پێی ووتی :

( پارێزگاری لێ بكە چونكە ئەوە ئەمانەتە لە گەردنتدا )

ئایا بیرت لەوە کردۆتەوە کاتێك لە ژنەکەت دەدەیت خیانەتت لە ئەمانەت کردوە ؟!

ئەی مێردی بەڕێز : ئاممان نەکەی وا بزانی لە گەورەیی تۆوەیە و منەت بکەی بەسەریدا لەوەی کە ڕێگەی پێ دەدەی سەردانی کەس و کاری بکات!! .

تۆش ئەی خوشکی بەڕێز: تۆ ئەمینداری بەسەر ماڵ و مێردەکەتەوە ... لەبەر ئەوە نهێنیەکانی بپارێزە ... سوربە لەسەر گوێڕایەڵی ... سور بە لەسەر پەروەردەکردنی منداڵەکان لەسەر ئیسلام ... ئەمانە کۆمەڵێك شتن کە لە گەردنی تۆدایە .

## پێنجەم : ئەمانەتی منداڵ لە مامەڵەکردنی لەگەڵ باوك و دایکدا..

ئەمەش جۆرێکی ترە لە ئەمانەت ...

بۆ نمونە هەڵگرتنی بڕێك پارە بەبێ پرسی دایك و باوك ... ئەمە خیانەتە لە ئەمانەت ئەگەر بڕەکە زۆر کەمیش بێت ... ( ئەمانەت بەشبەش نیە ) .

ئەمانەت ئەوەیە کە پرسیان پێ بکەیت و ئەوانیش ڕەزامەندی بنوێنن ، چونکە تەنها ئاگادارکردنەوەیان بەس نیە ، بەڵکو دەبێ ڕەزامەندیش دەربڕن .

## وا دەزانن شتێکی سادەو ئاسانە ،
## بەڵام لای خوا زۆر گەورەیە..

ئەمە بەشێکی زۆر هەستیارە لە ئەمانەتی منداڵ لەبەرامبەر دایك و باوکی ... وەبەتایبەت کچان زۆر تێی دەکەون ... !! دەبینی کچێك لە پشت کەسوکاریەوە پەیوەندی لەگەڵ کوڕێکدا دەبەستێت .

ئایا دەزانی کە ئەم کچە بەم کارەی خیانەتی لە ئەمانەت کردوە ؟

ئایا خۆت ئامادەکردوە بۆ ئەم جێگەیە؟

کاتێك لەبەردەمی خوایگەورەدا وەستاوی و ئەم خیانەتەت بۆ باس دەکرێتەوە و لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکرێ ؟! ئەی لاو بیرت لەو ڕۆژە کردۆتەوە؟.

یاالله ...!! ئەی ئەگەر ئەو کچە دراوسێت بوو ...؟ ئەوە خیانەتەکە گەورەتر دەبێت ، ئێوە پێتان وایە ئەم شتانە بچوکن و لە باسی ئەمانەتدا جێیان نابێتەوە ؟ جا ئەی ئەوەی کەوا بیر دەکەیتەوە بڕوانە ئەم وتەیە :

ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێت :

**( ئێوە هەندێك کار دەکەن لەبەر چاوتان لە تاڵە موویەك باریکترە کە ئیمە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لە گوناهە گەورەکان دەمان ژمارد).**

زۆر ڕاستە:

﴿ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴾ النور: ١٥

**واتە: ئێوە وادەزانن شتێکی سادەو ئاسانە بەڵام لای خوا زۆر گەورە و گرانە.**

## شەشەم : ئەمانەتێك كە كۆتایی نایەت :

ئیستاش با باسەكە فراوانتر بكەین وە بڵێین:

هەر نیعمەتێك خوا پێی بەخشیوین ئەمانەتە ..وە پێویستە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم ئەمانەتە بگەڕێنیتەوە ،ئەمە واتایەكی گشتگیرە بۆ ئەمانەت .

**پەروەردەكردنی منالّەكانت ئەمانەتە ..**

نەكەی وا گومان بەری كە لەبەر ئەوەی پارەیان بۆ بەخەرج دەدەیت مافی ئەمانەتەكەت داوە ، نەخێر بەڵكو ئەمانەتەكە ئەوەیە كە پەروەردەیان بكەی لەسەر ئیسلام .

**تەندروستیت ئەمانەتە ..**

ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرت لەوە كردۆتەوە كە بەكێشانی جگەرە خیانەت لە ئەمانەت دەكەی ؟! گرنگی نەدان بە تەندروستی خۆت كەمتەرخەمییە بەرامبەر ئەمانەت .

**چاو ئەمانەتە ..**

ئایا بیرت كردۆتەوە ، كاتێك سەیری شتی حەرامی پێ دەكەیت خیانەت لە ئەمانەت دەكەیت ؟!.

**زمان ئەمانەتە .. گوێچكە ئەمانەتە .. بۆن كردن ئەمانەتە..**

**ئەو قژەی كە خوایگەورە پێی بەخشیوی ئەمانەتە..**

ئەی خوشكی بەڕێز بۆ ئەوەی پارێزگاری لەو ئەمانەتە بكەی ، پێویستە دایپۆشی ، وانیە ..!؟ .

**یاالله ...! بیر بكەرەوە لەگەڵمدا ...**

هەموو ئەو شتانەی خۆت بە خاوەنیان دەزانی ئەمانەتن لەلات وە لە ڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ ... ئێستە هەست بە گەورەیی باسەکە دەکەی !؟

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ :

﴿ لا تزول قدما عبد يوم القيامة حتى يسأل عن أربع : عن عمره فيما أفناه . وعن شبابه فيما أبلاه . و عن ماله من أين اكتسبه و فيما أنفقه ، و عن علمه ماذا عمل به ﴾.

ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

واتە: دووپێی هیچ بەندەیەك ناترازێت لەڕۆژی قیامەتدا تاپرسیاری چوار شتی لێدەکرێت :لەتەمەنی لەچیدا بەسەری بردوە؟ وەلەگەنجێتی لەچیدا بەکاری خستوە؟ وەلەماڵوسەروەتیدا لەکوێ پەیدای کردوەو لەچیدا خەرجیکردوە؟ وەلەزانستەکەی چەند کردەوەی پێکردوە ؟

یاالله !! هەموو ئەمانە ئەمانەتن و پرسیاریان لەسەر دەکرێ ؟ خوایە پشتمان بە هێز بکەی .

## حەوتەم : ئەمانەتی هەڵگرتنی ئەم دینە..

کۆتا ئەمانەت و گەورەترینیان ، ئەمانەتی پارێزگاریە لەم دینە ، بزانە کە تۆ بەرپرسیاریت بەرامبەر ئیسلام ، وە لە ڕۆژی دوایدا پرسیارت لێ دەکرێ .

ئایا جێبەجێت کردوە و گەیاندوتەتە خەڵکی ؟

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ :

﴿ ... بلغوا عني ولو آية ﴾.

واتە: لەمنەوە بیگەێنن ئەگەر ئایەتێکیش بێ .

ئایا دەستی هاوڕێکەت یان نزیکەکەت یان دراوسێکەت گرتوە؟ ئایا تۆ هۆکاری خۆشەویستی ئەوانیت بۆ ئیسلام ...؟

ئەم دینە ئەمانەتە ...

ئیبن تەیمیە دەفەرموێت:

( وا گومان مەبە کە ئەمانەت ئەوە بێت کە دەستنوێژ بگریت و دوو ڕکات نوێژ بکەیت لە مزگەوتدا ، بەڵکو ئەمانەت ئەوەیە کە هەڵگری ئەم دینە بیت بۆ گەیاندنی بە خەڵکی ) .

دەتبینم ئیستا هەست بە گرنگی ئەم جۆرە ئەمانەتە دەکەیت وا نیە..!؟

سوێند بە خوا ئەمە کارێکی گرنگە ... خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ﴾ ال عمران: ١١٠

واتە: بەڕاستی ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە هێنراونەتە مەیدانەوە ، چونکە فەرمان بەچاکە دەکەن و قەدەغەی خراپە دەکەن .

بەچی ئەم نازناوەتان وەرگرت (خَيْرَ أُمَّةٍ)!!

ئاممان هەرگیز وا بیرنەکەیتەوە کە تەنها زاناکان بەرپرسیارن بەرامبەر بە ئەم دینەو بڵاوبونەوەی ، ئاممان نەڵێی بەرپرسیارێتی ئەم دینە تەنها لە ئەستۆی ئەزهەرییەکاندایە ، نەخێر بەرپرسیارێتی ئەم دینە لەئەستۆی هەموو مسوڵمانان دایە ، هەڵگرتنی ئەم دینە بەجوانترین و باشترین شێوە ئەمانەتەو لەگەردنی یەکە یەکەماندایە ، پێویستە بگاتە دایك و باوك و نزیکەکانمان ، دراوسێ و هاوڕێ و هاوکارانمان ، هاوسەران و ... هەرچی دەی ناسی.

## ڕەوشتی باوەڕدار

### ئیسلام ئەمانەتە ..

ئیستا هەست دەکەی ئێمە ئەمانەتمان لە بازنەیەکی بچوکدا باس کردوە! ڕوون بوەوە کە هەموو ژیانمان ئەمانەتە... هەستێکە پێویستە پێت گەیشتبێت خۆ گەر تاکو ئیستا نەگەیشتبێت ئەوا دڵت شتێکیەتی، بەڵام پێم وایە گەیشتوە وانیە؟.

ئیستا ئەم ئایاتەش بخوێنەرەوە ، دەزانم زۆر جار خوێندوتەتەوە ، بەڵام بەهەستەوە بە ئیمانەوە ئەم جارەش بیخوێنەرەوە :

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾ الأحزاب: ٧٢

**واتە: بێگومان ئێمە ئەم ئەمانەتەمان نیشانی ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکاندا ، بەڵام هەموان دەستیان پێوەنا و ترسان لێی ، کەچی ئادەمیزاد هەڵی گرت و گرتیە ئەستۆی خۆی ،بەڕاستی زۆر ستەمکارو نەفام بوو .**

دەبینم سەرت ڕادەوەشێنی ئەوەش بەڵگەیە لەسەر قوڵی تێگەیشتنەکەت ، بەڕاستی ئەمانەتێکی قورسە.

خوایە بمانگێڕە لەو مسوڵمانانەی کە بەڕاستی ئەم ئەمانەتەیان هەڵگرتوە.

لە کۆتاییدا دوعاکەی گەورەمان عومەری کوڕی خەتتاب دەخوێنینەوە کە دەی فەرموو: ( اللهم قوِ ظهری و لا تخفف حملی ).

**واتە: خوایەگیان پشتم بەهێزبکە ، بارەکەم سوک مەکە !!.(واتە کارەکانم سوک مەکە بەڵکو توانام بدەریٚ تاکارە قورسو گران و مەزنەکان ئەنجام بدەم ).**

# وەفاداری

## بەپرسیارێك دەست پیٚ دەكەین..

**ئایا تۆ وەفاداری ..!؟**

دەتبینم خۆت قیت دەكەیتەوە و دەڵێت : بیٚ گومان من وەفادارم ،هیچ كات شتە جوانەكانم بیر ناچێتەوە. ئەمانە وەڵامێكی جوانن داواكارم خوای گەورە لە تەرازووی چاكەكاندا بینوسێت ، بەڵام دەمەویٚ كەمێك بیر بكەیتەوە من پێنج پرسیارت لیٚ دەكەم و لە دوای ئەوە پرسیارەكە دووبارە دەكەمەوە ...

**ئایا تۆ بە وەفای ؟**

وەفاداری ووشەیەكە گوێچكە حەزی پیٚ دەكات ... ووشەیەكە دڵ حەزی پیٚ دەكات .... سەیری ئەو هەستە بكە كە بەرامبەر ئەو كەسانە بۆت دروست دەبێت كە ئەم خەسڵەتەیان تیایە .. هەست كردن بە ئارامی .. هەست كردن بەخۆشی و دڵنیایی..هەست دەكەی ئەم ڕەوشتە ئەمینداری نهێنیەكانی ئەم ژیانەیە ... ڕەوشتی وەفاداری پێشەنگی ڕەوشتەكانە لە مامەڵەی خەڵكی لەگەڵ یەكتردا ... تۆ ناتوانی چا بخۆیتەوە بەبیٚ شەكر وانیەیە ؟ وەك بڵێی چایەكە دنیایە و شەكرەكەش وەفایە ... دەزانم كە تۆ هەرگیز ناتوانی چا بخۆیتەوە بە بیٚ شەكر !.

## وەفاداری و پێنج پرسیارەکە..

ڕەوشتی وەفاداری لە پێنج پرسیاردا کۆ دەبێتەوە ، ئەگەر بە بەڵێ وەڵامت دایەوە ئەوا وەفاداری ، خۆ ئەگەر بە نەخێر وەڵامت دایەوە ئەوا......... !!.

پرسیارەکانیش ئەمانەن :

پرسیاری یەکەم: تۆ وەفاداری بەرامبەر خوا ؟.

پرسیاری دووەم : تۆ وەفاداری بەرامبەر بە پێغەمبەر(ﷺ) ؟.

پرسیاری سێیەم : تۆ وەفاداری لە مامەڵەکردن دا لەگەڵ خەڵکی ؟.

پرسیاری چوارەم : تۆ وەفاداری بەرامبەر ئەوەی کە چاکەی لەگەڵدا کردوویت ؟.

پرسیاری پێنجەم : تۆ وەفاداری بەرامبەر بە وانەی لە سەفەری تەمەندا دەیان ناسیت ؟.

دەبینم بە شێوەیەکی ئاسایی پرسیارەکان دەخوێنیتەوە وە بە سادەیی بەسەریاندا تێ دەپەڕی ، بەڵام مەبەست تەنها خوێندنەوەیان نیە و بەس ، بەڵکو مەبەست وەڵامەکەیەتی ..

دەی ... بەڵێ تۆ ... سەر لەنوێ پرسیارەکان بخوێنەرەوە و هەر ئێستا وەڵامیان بدەرەوە گوێم لێتە دەڵێیت : بەڵام لە مەبەستی پرسیارەکان تێ ناگەم؟.

کەواتە لەگەڵماندابە بە دڵ و گیان و لە خوێندنەوەی ئەم باسەدا نیەتت ئەوەبێ کە ببیتە کەسێکی بە وەفا بەویستی خوا ..

ئایا تۆ ئامادەی!!؟.

ئەمەش دروشمەکەمانە :

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:

﴿ لا دین لمن لا عهد له ﴾ .ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

واتە: ئەوەی عەهدو پەیمانی لانەبێت ئاینیشی نیە !

فەرموودەیەکی توندە ... لێرەدا مەبەست ئەوە نیە ئەوەی وادەوبەڵێنی نەبوو موسڵمان نیە ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە باوەڕی تەواوی نابێت ... کەواتە ئەی ئەوەی کە خیانەتکاری ... ئەی ئەوەی کە فێڵ دەکەی ... ئەی ئەوەی وادەو بەڵێنت نیە ، وریابە ... باوەڕت تەواو نابێ مەگەر بە وەفاداری نەبێ ، لەبەر ئەوە دروشممان لە ڕەوشتی وەفاداریدا ئەمە بێت:

﴿ لا دین لمن لا عهد له ﴾.

## ئیسلام کۆیە و بەش بەش ناکرێت..

وەرن با پرسیاری یەکەم لە خۆمان بکەین :

ئایا تۆ وەفاداری بەرامبەر خوای گەورە ؟

پێش وەڵام ئایا شتێکت هەست پێ کردووە ...؟

ئێمە لە هەموو ڕەوشتێکدا پەیوەندیەکی سەیر دەبینین . پەیوەندی هەموو ڕەوشتێك بە خواوە ، چاکەکاری و ئەمانەت و هتد ... .

پاکوبێ گەردی بۆ خوا !!

## ڕەوشتی باوەڕدار

ڕەوشت بەشێکە هەرگیز جیا ناکرێتەوە لە باوەڕی ئیسلام ، ئیسلام کۆیە و بەش بەش ناکرێ ... وە ڕەوا نیە کە هەندێکی وەربگریت و هەندێکی تری واز لێ بهێنیت .

حاڵی مرۆڤی ڕێك نابێتەوە ، مەگەر ئیسلام وەك یەك بەرنامەی فراوان بۆ ژیان وەرگرێت ...

سەیری ئەوانە بکە کە بەشێك لە ئیسلام وەردەگرن ، کەسێتی‌یەکی خوار و ناڕێکیان هەیە ، ئەم دینە چ دینێکی گەورە و بەڕێزە گەورەکان دروست دەکات .

## یەکەم : وەفاداری لەگەڵ خوادا..

**لە گەورەترین جۆرەکانی وەفا ئەوەیە کە:**

**بەوەفا بیت بەرامبەر ئەو کارانەی کە خوا فەرمانی پێ کردویت ..**

دەبینم دەڵێی : وەفام بەرامبەر چی هەبێت ؟ خۆ من سوێندم بەخوا نەخواردووە بە ئەنجامدانی شتێك ،بەڵێنم بەخوا نەداوە کە کارێك بکەم! بەلاٌم برا خۆشەویستەکەم بەهەڵە حاڵی بووی ..

**ئایا نیعمەتەکانی خوات لەیاد چوە بەسەرتەوە؟**

**ئایا ئەم هەموو نیعمەتە شایستەی وەفاداری نی‌یە ؟**

﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ﴾النحل: ٥٣

**واتە: هەرچی نازونیعمەتێکتان هەیە هەمووی بەخشش و بەهرەی خوایە .**

بیهێنە پێش چاوت کەسێك دایك و باوکی خزمەتی دەکەن و بەبێ کەموکوڕی گەورەی دەکەن ، بەلاٌم دەرەنجام ئەو کەسە نکوڵی لە

خزمەتەکەیان بکات !! چۆن وەسفی ئەم کەسە دەکەی !؟ وە چۆن سەیری دەکەی ؟!.

نمونەی بەرز و بالا بۆ خوایە ..
نیعمەتەکانی خوا لە ژمارە و ژماردن نایەن ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ وەفای نی‌یە بەرامبەر ئەو نیعمەتانە ...
دەبینی لە کاتی خۆیدا نوێژەکەی ئەنجام نادات.
دەبینی بالاپۆشی لەیاد دەکات کوا وەفا لەگەڵ خوادا ؟.
ئێستە لە مەبەستەکە تێگەیشتی ...!؟

## چۆن بەوەفا بم لەگەڵ خوادا ؟

دەزانم ئێستە پرسیار دەکەیت و دەڵێیت:
**چۆن بەوەفا بم لەگەڵ خوادا ؟**
ئەم پرسیارەش بەڵگەیە لەسەر زیندوێتی وتێگەیشتن ... بۆ ئەوەی بەوەفا بیت لەگەڵ خوادا پێەویستیت بە سێ شت هەیە:
١: باوەڕ هێنان پێی .
٢: بە تەنها کارکردن بۆی .
٣:جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و دورکەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکانی.
ئەگەر توانیت ئەم سیانە جێبەجێ بکەی ئەوا تۆ بە وەفای لەگەڵ خوادا.
ئێستە پەیمانم پێ دەدەی کە ئەم سیانە بەهەند وەربگری ؟

## ڕەوشتی باوەڕدار

**خوایگەورە دەفەرموێ:**

﴿ لِّتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا (٩) إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا (١٠) ﴾ الفتح: ٩ - ١٠

**واتە: بۆ ئەوەی ئێوە باوەڕ بهێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی و پشتیوانی لە پێغەمبەر بکەن و ڕێزی شایستەی خۆی لێ بگرن و تەسبیحات و ستایشی خوا بکەن لەبەرەبەیان و عەسراندا ، بێگومان ئەوانەی پەیمان دەدەن بەتۆ ئەی محمد لە راستیدا هەر پەیمان بە خوا دەدەن .. دەستی پیرۆز و بەتوانای خوا لەسەرو دەستیانەوەیە ، جا ئەوەی پەیمانەکە بشکێنێت و لێی پاشگەز ببێتەوە ئەوە لەسەر خۆی دەکەوێت ، ئەوەش کە پەیمانەکە دەباتە سەر پاشگەز نابێتەوە لێی خوای بالادەست ئەجرو پاداشتی گەورەی پێ دەبەخشێت .**

**هەروەها بەرامبەر (بەنی ئیسرائیل) دەفەرموێ:**

﴿ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُوا بِعَهْدِي أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ ﴾ البقرة: ٤٠

**واتە: ئەی نەوەی ئیسرائیل ، یادی نازونیعمەتی من بکەنەوە کە بەسەرتاندا رژاندومە و بەوەفا و بەئەمەك بن و پەیمانەکەم جێبەجێ بکەن ئەوسا منیش پەیمانی خۆم بەجێدەهێنم ، با ترسوبیمتان تەنها لەمن هەبێت .**

**ئێستە بڕیاڕ بدە کە:**

- **باوەڕی تەواوت هەبێت بە خوا .**
- **تەنها لە کارەکانتدا مەبەست ڕەزامەندی ئەو زاتە بێت .**
- **کار بکە بەوەی کە فەرمانی پێ کردووی..**
- **دوور بکەوەرەوە لەوەی کە قەدەغەی لێ کردووی..**

## تۆ لە کوێدای لە وەفاداری لەگەڵ خوادا !؟

**سەیری وەفای پێغەمبەر (ﷺ) بکە لەگەڵ خوادا ..**

**شەوان شەونوێژی دەکرد هەتا قاچەکانی دەئاوسا ، دایکی خۆشەویستمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەیفەرموو :**

**ئەی پێغەمبەری خوا ، ئایا خوای گەورە لە گوناهی بەرو دوات خۆش نەبووە ؟**

**ئەویش (ﷺ) بەوپەڕی وەفاداری یەوە دەیفەرموو:**

﴿ أفلا أكون عبداً شكوراً ﴾. بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: ئەی نابێ من بەندەیەکی سوپاس گوزار بم!!.**

**تۆ کەسێکت خۆش دەوێت کە لەدنیادا یارمەتی داویت ، هەوڵ دەدەیت کە بەوەفا بیت بەرامبەری ...**

**ئایا خوای گەورەت خۆش دەوێت ؟.**

**ئایا بەوەفای بەرامبەر بەو بەڵێنەی کە داوتە بە خوا ؟.**

**ئێمە کۆمەڵێك داواکاری و ئەرکی زۆرمان لەسەرشانە کەواتە با وەفادار بین و بەڵێنەکانمان نەشکێنین لەگەڵ خوادا ..**

﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ البقرة: ٤٣

**واتە: نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش بدەن.**

**ئایا بە وەفای ؟**

۞ ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ ﴾ النور: ٣٠

**واتە: ئەی پێغەمبەر بە پیاوانی ئیماندار بڵێ : چاویان بپارێزن .**

**ئایا بە وەفای ؟**

﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَـٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَـٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ﴾ النور: ٣١

**واتە: بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ چاویان بپارێزن ، داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناه و جوانی خۆیان دەرنەخەن .**

**ئایا بەوەفای ؟**

**ئێوە لە کوێدان لە وەفاداری لەگەڵ خوادا ؟ ئەی دڵی بێ ئاگا بە ئاگا وەرەوە پێش ئەوەی کار لەکار بترازێ.**

## لە باوەڕداراندا پیاوانێك هەن..

**خوای گەورە دەفەرموێ :**

﴿ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ﴾ الاحزاب: ٢٣

**ئەوانە جۆرێکن لە باوەڕدارە ڕاستگۆکان ئەوانەی کە ڕاستگۆن لەگەڵ ئەو پەیمانەی کە داویانە بەخوا ...**

**بپاڕێرەوە و دوعا بکە کە لەوانە بیت.**

﴿ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا ﴾ الأحزاب: ٢٣

**واتە: مەردانێکی زۆرهەن لە ئیمانداران راستگۆبوون بەرامبەر ئەو پەیمانەی کە داویانە بەخوا ، پابەندبوون پێوەی و لایاننەدا لێی ، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێکرد و مرد لەسەری ، هەشیانە چاوەڕوانە ، بەهیچ شێوەیەك گۆڕان و لاری ڕوی تێ نەکردوون .**

**سەیری چڵەپۆپەی وەفا بکە ... ئەم ئایەتە سەبارەت بە هاوەڵی بەڕێز (ئەنەسی کوڕی نەزر ) دابەزیوە ، ئاشکرایە کە ئەنەس لەبەر ئەوەی لەوکاتەدا لە سەفەر بوو نەیتوانی بەشداری جەنگی بەدر بکات ، لە دوای جەنگەکە وتی : ئەگەر ئەم جارە خوا یارمەتیم بدات وبگەمە کوشتاری بێ باوەڕان ئەوجا دەزانم چی دەکەم.**

کاتێك جەنگی ئوحود هاتە پێشەوە و موسوڵمانان شکان و پاشە کشەیان کرد ، ئەنەسی کوڕی نەزر ڕوەو بێ باوەڕەکان کەوتە ڕێ و هەموو موسوڵمانانیش ڕوەو مەدینە ، دیارە کە ئەنەس بیریەتی چی وتووە ... سەیری وەفاداری بکەن !! گەیشت بە سەعدی کوڕی مەعاز سەعد پێی ووت : بۆ کوێ ئەی ئەنەس ؟ ئەنەس فەرمووی : بە خوای نەزر دەچم بۆ بەهەشت ، لە لای ئوحودەوە بۆنی دەکەم .
دەڵێن : ئەنەس لەلای کێوی ئوحوددا وەفاتی کرد ، بینیمان لاشەی هەشتا و ئەوەندە برینی پێوەیە ، تەنها خوشکەکەی بە هۆی پەنجەکانیەوە ناسیەوە .
دەبینم بەم ووشەیە (ئەوجا دەزانم چی دەکەم) هیممەتت بەرز بوەوە ، دەی تۆش ئێستە بیڵێ ... بیکە بە مەشخەڵێك بۆ خۆت ، بە هیممەت و وەفای ئەنەس ببە بە ﴿ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ﴾.
ئایا ناتەوێت ڕاستگۆ بی لەوەی کە بەڵێنت بەخوا داوە..!!؟.

## ئاممان نەکەی لەو پۆلە بیت ...!!

**خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿ وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴾ التوبة: ٧٥ - ٧٦

**واتە: لەدووڕووەکان کەسانێك هەن کە پەیمان و بەڵێنی بەخواداوە : سوێند بەخوا ئەگەر خوا ماڵ و سامان و دارایمان پێببەخشێت بەڕاستی زەکات و خێری لێ دەردەکەین و بێگومان لەڕیزی کەسانی چاك و خواناسیشدا دەبین .. جا کاتێك خوا لە فەزڵ و بەرەکەتی خۆی پێدان بەهرەوەری کردن ئەوان ڕەزیلیان تێدا**

## ڕەوشتی باوەڕدار

کردو پشتیان لەبەڵێنەکانیان کرد لەکاتێکدا کە ئەوان هەمیشە لەبەڵێن و پەیمان پشتهەڵکەرن .

یاالله ....!! ئێمە کەمێك لەمەوپێش لە ژینگەیەکی ئیمانیدا بوین لەگەڵ پیاوانی ڕاستگۆدا بەڵام ئێستە .........!!

جارێکی تر ئایەتەکان بخوێنەرەوە و پاشان سەیری هەڵوێستی خیانەتکاران . ئەوانەی کە بەڵێنەکانیان دەشکێنن چاو لەهەڵوێستی ئەنەس بکە وە بیر بکەرەوە:

کاتێك وەتبوت گەر خوای گەورە ئەم سەیارەیەم پێ ببەخشێت فلان کار و فلان کاری پێ دەکەم ...!!.

کاتێك وەتبوت پاش ئەوەی شوم کرد پۆشاکی بالاپۆش دەپۆشم ..!!

پێدەچێ زۆر ئەم ئایاتانەت خوێندبێتەوە بەڵام داتنەبەزاندوە بۆ سەر خودی خۆت بە ڕاستی کۆمەڵێك ئایەتی توندن ئایە ئێستە لێیان تێگەیشتی ؟ دەترسم بەوەفا نەبوبی بەرامبەر بە پەیمانێك کە بە خۆتت دابێت ؟.

بیرتە کە ئەتووت: کاتێك خوێندنم تەواوکرد و کەوتمە سەرکاری خۆم ئیتر ئەو وەختە کاتەکانم دابەش دەکەم و زۆر بە ئاسانی دەتوانم نوێژی بەیانی ئەنجام بدەم ئایا وەفات کردوە بەو بەڵێنەتەوە ؟.

بیرتە کە ئەتووت: لە هاویندا هەموو ڕۆژێك قورئان دەخوێنم ، ئایا وات کردوە ؟.

دەبینم کۆمەڵێك شتی زۆرت بیر کەوتۆتەوە ...!!

کەواتە لە خۆت بپرسەرەوە پێش ئەوەی لێت بپرسرێتەوە

## ئەم پەیمانەشت لە بیر بێت ...!!

**خوای گەورە دەفەرموێ :**

﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾ يس: ٦٠ **واتە: ئەوسا خوای گەورە گلەیی لە یاخیەکانی نەوەی ئادەم دەکات و دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم مەگەر من پێم ڕانەگەیاندن کە شەیتان نەپەرستن چونکە ئەو بەڕاستی دوژمنی ئاشکراتانە .**

**لە میانەی ئەو پەیمانانەی کە هەمانە لەگەڵ خوادا دوژمنایەتی شەیتانە، ئاممان نەکەن ئەم پەیمانەتان لەیاد بچێت ، یان بێ ئاگابن لێی .**

**کوا دوژمنایەتیەکەت لەگەڵ شەیتاندا ..؟! کوا پابەندبونت بە ئەم وادە و بەڵێنەوە..؟! ئایا بەوەفای بەرامبەری ...!؟.**

**ئەترسم بەوەفا بیت بەرامبەر شەیتان ..!! وە بەرامبەر خوای بە بەزەیی خیانەتکار بیت .!.**

## وەفا بە نەزر دەکەن..

**خوای گەورە دەفەرموێ :**

﴿ يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُۥ مُسْتَطِيرًا ﴾ الانسان: ٧

**واتە: وەفا بەنەزر دەکەن ، یاخود بەڵێنێکیاندا وەفادارن و ئەنجامی دەدەن و بیمیان هەیە لە رۆژێك کە شەڕی لێ دەبارێت و پرش و بڵاوە.**

**لەو بەڵێنانەی کە لەگەڵ خوادا هەمانە نەزرە ، لەبەر ئەوە دەبێت بە وەفا بین بەرامبەریان..**

## ڕەوشتی باوەڕدار

( پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ووتی:

ئەی پێغەمبەری خوا خوشکەکەم نەزری کردوە کە حەج بکات ، بەڵام وەفاتی کرد و نەزرەکەی جێبەجێ نەکردوە ، چی بکەم ؟

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی:

ئایا ئەگەر خوشکەکەت قەرزێکی لەسەر بێت بۆی دەدەیتەوە ؟ پیاوەکە ووتی: بەڵێ ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : دە قەرزی خوا بدەنەوە ، چونکە خوا لە پێش ترە وەفادار بیت بەرامبەری ).بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

زۆر شت نەزرە لەسەرمان بەرامبەر بە خوا بەڵام وەفادارنین بەرامبەری ، وانیە ..؟

سەر لەنوێ دەست پێ بکەرەوە ... ئەمە بەگەورە بزانە چونکە حەقی خوایە بەسەرتەوە ،خوای گەورەش لە پێشترە کە بەوەفا بیت بەرامبەری.

## وەفاداری بەرامبەر بە سوێندەکانمان..

جۆرێکی تر لەو پەیمانانەی کە لەنێوانماندا هەیە ، ئەوەیە کە سوێندت خوارد ، سوێندەکەت جێبەجێ بکەیت و بەوەفا بیت بەرامبەری..

خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُوا الْأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾ النحل: ٩١

واتە: بەوەفا و بەئەمەك بن بۆ ئەنجامدانی پەیمانی خوا کاتێك بڕیاری دەدەن و سوێند و پەیمان و بەڵێنتان هەڵمەوەشێننەوە دوای ئەوەی کە دوویات کرابووەوە و

تەئکیدی لەسەر کرابوو لەکاتێکدا کە ئێوە خۆتان کردوّتە کەفیل و زامن بەسەر خۆتانەوە ، بێگومان خوا دەزانێت بەو کاروکردەوانەی کە دەیکەن .

پێویستە بەوەفا بیت بەرامبەر سوێندێك کە خواردوتە ، ئەگەر وانەکەیت ئەوا ئەم فەرمودەیەت پێ دەڵێم کە دەفەرموێ:

﴿ ثلاث أنا خصيمهم يوم القيامة ﴾ لەوانە ﴿ورجل أعطى بي ثم غدر ﴾

بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

واتە: سێ کەس هەن من دژواریانم لەڕۆژی قیامەتدا ( ڕوبەڕویان دەبمەوە) یەکێك لەوانە : ئەوەی بەنزیکی لەخواوە(یابەسوێند خواردن) شتێك دەگرێتە دەستو پاشانیش غەدرو خیانەتی لێدەکات !

﴿أعطى بي ﴾ واتە سوێندێك بخوا و بڕیارێك بدات و بڵێت وادەکەم و وادەکەم و بەلاّم خیانەتی لێ بکات و سوێندەکەی نەباتە سەر .

زۆربەی کات ئێمە دەکەوینە ئەم حاڵەوە .. ئەو کارەم بۆ بکە سوێند بە خوا وات بۆ دەکەم وات بۆ دەکەم ، پاشان خیانەت دەکات و بەو جۆرە ناکات .. هەندێك جاریش بیرت دەچێت .. وانیە ؟

دەبینم کەمێك هەستت بە ئارامی کرد کە ووتم : تۆ بیرت دەچێت ، بەلاّم ئەوا بەهانەیەکی ناشیرینترە لە گوناهەکە.

## ئێستا لە خۆت ڕازیت !!!

پوختەی وەفاداری لەگەڵ خوادا ئەوەیە :

❁ باوەڕی پێ بهێنین .

❁ تەنها لەبەر خاتری ئەو زاتە کار بکەین .

❁ کاربە فەرمانەکانی بکەین و لە قەدەغەکراوەکانی بە دوور بین .

## ڕەوشتی باوەڕدار

ئیستا چەند لە (١٠) دەهێنی ... پلەیەك بۆ خۆت دابنێ و ، خۆ ئەگەر ئیستا پێنج لە دە بۆ خۆت دابنێیت ئەوا بە پشتیوانی خوا ماوەیەکی تر دەیکەیتە حەوت لە دەو دواتر نۆ لەدەو دواتر دە لە دە، ئینشاالله ... گرنگ ئەوەیە تۆ ڕازیت لەخۆت لە وەفاداریت لەگەڵ خوادا ...؟

بزانە هەرکەس بە دوای خێردا بگەڕێت دەستی دەکەوێ.

## دووهەم : وەفاداری لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ)..

ئەمە جۆری دووهەمە لە جۆرەکانی وەفاداری ، بەڵام:

چۆن ئێمە بەوەفا بین لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ؟

هاوەڵان زۆر بەوەفا بوون لەگەڵیدا لەبەر ئەوەی لە ناویاندا بوو بەڵام:

ئایا تۆ چۆن وەفادار دەبیت لە گەڵیدا ؟

ئێستا وەفاداریت لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)بە شوێنکەوتنی سونەتەکانی دەبیت.

## وەفاداری هاوەڵان

## ئەبوبەکری صدیق و وەفاداری..

جابری کوڕی عبدالله هاوەڵێکی هەژاربوو ڕۆژێکیان لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) دەڕۆیشتن ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

ئەی جابر ئەگەر پارەی بەحرەینم بۆ بێت ، دابەشم دەکردو ئەوەندەو ئەوەندە و ئەوەندەم دەدایتێ ...، پارەی بەحرەین نەهات ، وە

پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد ، ئەبوبەکر هات و هاواری کرد لە خەڵکی: ئەی خەڵکینە هەرکەسێك شتێك یان قەرزێکی لای پێغەمبەر (ﷺ) بوە با بێت بۆ لامان ، جابر دەڵێ: چومە لای و پێم ووت : پێغەمبەری خوا فەرمویەتی ئەگەر پارەی بەحرەینم بۆ بێت ئەوا ئەوەندەو ئەوەندە ئەوەندەت دەدەمێ . جابر: دەڵێ ئەبوبەکر پارەی هێنا و دایمێ ، ژماردم پێنج سەد درهەم بوو ، وویستم بڕۆم ئەبوبەکر فەرموی بوەستە : ئەوەندەی تریش بەرە ، ووتم بۆچی ؟ فەرموی: پێغەمبەری خوا پێی فەرمویت ئەوەندە و ئەوەندە و ئەوەندە !!.

سەیری وەفای ئەبوبکر بکە ، دەبینم باسەکەت بەلاوە ئاسایی بوو ... سوێند بەخوا حەقی خۆتە ، چونکە ئەوە ئەبوبکری صدیقە ، ئەگەر ئەو بەوەفا نەبێت ئەی کێ بەوەفا بێت ...!؟.

## وەفاداری عومەری کوڕی خەتتاب..

هەموومان دەزانین کە چی ڕوویدا لە نێوان پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبوبکر لەگەڵ سوراقەی کوڕی مالیکدا لە ڕێگەی کۆچدا ، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ)بە سوراقەی فەرموو:

( بڕۆ ئەی سوراقە ، بازنەکانی کیسرا بۆ تۆ ) .

لەپاش ئەوە سوراقە مسوڵمان بوو ، پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد ، وە ئەبوبکر بووە جێنشین و ئەویش وەفاتی کرد ، عومەری کوڕی خەتاب هات و فەتحی( مدائن )ی کرد ، ئاڵتونەکانی کیسرایان هێنا ، لە مزگەوتدا دایان نا ، عومەری کوڕی خەتاب لەسەریان وەستاو فەرمووی: کوا سوراقە ؟ سوراقە ووتی : بەڵێ ئەی ئەمیری بڕواداران ،

ئیتر عومەری کوڕی خەتتاب بازنەکانی کیسرای پێ بەخشی ، وە بەڵێنەکەی پێغەمبەری خوای جێبەجێ کرد.

( سوراقە بازنەکانی وەرگرت و دەستی کرد بە گریان و تەواوی مزگەوت ئاوێزانی قوڵپی گریان بوو ).

ئایا عومەر بە وەفا بوو ..!؟

پاش ١٥ یان ١٦ ساڵ بەوەفا بوو بەرامبەر بەڵێنەکەی پێغەمبەر (ﷺ).

تێبینی بکە هەموویان ئاگاداری ئەو بەڵێنە بوون . سوێند بەخوا وا هەست دەکەیت کە هەموویان بەوەفا بوون لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دا .

## وەفای یەزیدی کوڕی سەکەن..

سەیری جەنگی ئوحود بکە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

( هەر کەس لێمیان دوورخاتەوە بەهەشتی بۆ هەیە ) موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

یەزید لاوێکی بچوك بوو ، هاتە خزمەتی حەزرەت و بەرگری دەکرد و پارێزگاری لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد هەتا شەهید بوو ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ڕومەتی بخەنە سەر قاچم ، سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی :

( خوایە شایەتی دەدەم کە یەزیدی کوڕی سەکەن زۆر وەفادار بوو ).

پێغەمبەر (ﷺ) خۆی شایەتی وەفاداری یەزید دەدات : بەڕاستی پلەو پایەیەکی گەورەیە .. وانیە ؟

ئیستا چەندە لە خۆت ڕازیت ..!؟

وەفاداری ئەبوبكرو عومەر و یەزیدت بینی ، دیارە زۆرێكی تر لە هاوەڵانی بەوەفا هەن بەڵام ئێمە بەم سیانە كۆتاییمان پێ هێنا ، جا بزانە تۆ خۆت لە كوێی وەفاداریدا دەبینیتەوە.

لە سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ) كە لە مزگەوتدا نوێژ بكەین ... ئایا وەفاداری بەرامبەری ؟

لە ڕۆژی قیامەتدا پێغەمبەر (ﷺ) دێت و دەفەرموێ :

﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوْمِى ٱتَّخَذُوا۟ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا ﴾ الفرقان: ٣٠

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) سكاڵا دەكات و دەفەرموێت: پەروەردگارا بەڕاستی قەومەكەم وازیان لەم قورئانە هێناوە و پشتگوێیان خستوە و گرنگی پێ نادەن .

ئایا تۆ لەوانەی كە دوركەوتونەتەوە لە قورئان ..!؟

بەمە ئازاری پێغەمبەر(ﷺ)و هاوەڵان دەدەیت ، ئایا وەفاكەت بەرامبەریان ئەوەیە كە واز لە قورئان بهێنی ؟!.

ئایا وەفات بەرامبەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیە كە واز لە سوننەتەكانی بهێنی ؟.

بیر بكەرەوە و ئیستا بچۆ وەرەقەو قەڵەمێك بهێنەو تیای بنوسە :

( من دەتوانم بەوەفا بم بەرامبەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەوەی كە ١..........٢..........٣.......... و ئیتر بزانە چۆن ئەم خاڵانە جێبەجێ دەكەیت ، ئەو كات پرسیار بكە لە خۆت :

ئایا تۆ لە خوات ڕازیت ....!؟.

## سێهەم : وەفاداری لە مامەڵەكردنت لەگەڵ خەڵكیدا..

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

## ڕەوشتی باوەڕدار

﴿ المسلمون عند شروطهم ﴾ بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: موسوڵمانان پابەندن بەو پەیمانانەی ئەیدەن.**

**هەرکات ڕەزامەندیت نواند لەسەر شتێك پێویستە کە جێبەجێی بکەیت ، بزانە کە لە نیشانەکانی دووڕوویی خیانەتە لە وادەو پەیمان.**

**پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ :**

﴿ اربع من كن فيه فهو منافق ..... واذا عاهد غدر ... ﴾ بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: چوارشت لەهەر کەسێکدا بێت ئەوە دوڕووە، لەوانە ئەگەر پەیمانی دادەیشکێنێ .**

**خوای گەورە دەفەموێ:**

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۚ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴾
الاسراء: ٣٤

**واتە: نزیك ماڵی هەتیو مەکەون مەگەر بەجوانترین شێوە نەبێت هەتا نەگاتە هەڕەتی لاوی ،وەفا بکەن بە بەڵێن و پەیمان چونکە بەڕاستی بەرپرسیارن لەبەرامبەر بەڵێن و پەیمانەوە .**

## به ڕەوشتی وەفاداری خەڵکی( حمص )

## مسوڵمان بوون ..!!

**یەکەم شت لە وەفاداری لەگەڵ خەڵکیدا ، مامەڵەی بواری شمەك و پارەیە ... سەدەها کێشە لەم ڕوەوە دروست دەبێت ... پێش ئەوەی ڕۆبچین لەم باسەدا ئەم بەسەر هاتە ڕاستەت بۆ دەگێڕمەوە لە مێژووی ئیسلامیدا ، ئەوجا شانازی بە مسوڵمانی خۆتەوە بکە :**

مسوڵمانان وڵاتی شامیان فەتح کرد ، ڕۆمەکان لەو سەردەمەدا ( حمص) یان داگیر کردبوو ، مسوڵمانان ڕزگاریان کردوو ڕۆمەکانیان وەدەرنا ، خەڵکی ( حمص ) نەصرانی بوون ، مسوڵمانان بانگیان کردن بۆ سەر ئیسلام ، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون و وتیان جزیە دەدەین ، ئەم جیزیەیەش دیارە بۆ پاراستنی خۆیان بوو.

ڕۆمەکان خۆیان ڕێك خستەوە بۆ ئەوەی هێرش بهێننەوە سەر(حمص ) مسوڵمانان دەربکەن و داگیری بکەنەوە ، لەوکاتەشدا سوپای مسوڵمانان خۆیان ئامادەکرد بۆ فەتحی نوێ ، وەداواشیان لە سوپای ناو( حمص ) کردبوو کە بێنەوە لای سوپای گەورەی ئیسلام و لە حمص هاتنە دەرەوە ، بەڵام مسوڵمانان جزیەیان لە خەڵکی ( حمص ) وەرگرتوە لە بەرامبەر ئەوەی کە بیانپارێزن ، ئیستاش دەچنە دەرەوە چی بکەن ؟

ئەو پارەیەی وەریان گرتبوو هەمویان گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان ، خەڵکی (حمص) سەریان سوڕما ... بۆچی پارەی جیزیەکەیان بۆ گێڕایەوە ! سەرکردەی مسوڵمانان ووتی : ئێمە ئەم پارەمان لە بەرامبەر پارێزگاری کردتان وەرگرتوە ئێستەش ئێمە دەچینە دەرەوە ئیتر بۆچی لێتان وەرگرین ؟ بەهۆی ئەم هەڵوێستەوە خەڵکی ( حمص ) هەموویان مسوڵمان بوون و ئەو سوپایەش مایەوە لەناو حمصدا وە هەمویان پارێزگاریان کرد لەو شارە دژی ڕۆمەکان .

**پاکو بێ گەردی بۆ خوا ..**

بە ڕەوشتی وەفاداری.. شاریك بە تەواری مسوڵمان دەبێت ڕەوشتێك لە ڕەوشتەکانی مسوڵمانان ، ئەویش ڕەوشتی وەفاداریە.

## ڕەوشتی باوەڕدار

کێشەی گەورەی ئێمە ڕەوشتە ، ڕۆژئاوا سەیری نوێژ و ڕۆژ و ... ناکات ،پەیوەندی بەوانەوە نیە ، بەڵکو سەیری ڕەوشتمان دەکات ، کاتێك قسەدەکەن دەڵێن وەکو ئائەوانە بین ........!؟

یان قسەی ئەو کەسە ڕۆژ ئاواییە کە مسوڵمان بوو پاشان بەمەبەستی حەج هاتبوو بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دواتریش ئەم ووتەیەی ووت:

( **سوپاس بۆ خوا پێش ئەوەی موسوڵمانان بناسم ئیسلامم ناسی** ).

خۆشەویستانم .. بە ڕەوشتمان ئاشکرا دەبین ، لەبەر ئەوە وریای ئیسلام بن ، ئێوە وێنای دەکەن .

## بەڵێنە بەهەدەرچوەکان..

لە وەفاداری بەرامبەر خەڵکی ئەوەیە کە بەوەفا بیت بەرامبەر بەڵێنەکان، وە هەموشمان لەم ڕووەوە کێشەمان هەیە ...

عبداللەی کوڕی ئەبی حەمسا دەڵێ:

پێش پێغەمبەرێتی شتێکم کڕی لە پێغەمبەر(ﷺ) و هەندێك پارەم لە لا مایەوە و بەڵێنم پێدا کە هەر لەو جێگەیەدا پارەکەی تری بۆ بهێنم ، ئیتر لە یادم نەما ، پاش ئەوە ، دوای سێ ڕۆژ بیرم کەوتەوە چومە شوێنەکە بینیم لە جێگەی خۆیدا وەستاوە ، سەیری کردم و فەرمووی ئەی لاو کارەکەت لەسەر قورس و گران کردم سێ ڕۆژە من چاوەڕێتم )

. ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

ئەوە پێغەمبەری خۆشەویسمانە (ﷺ)...

دەی با شوێن پێی هەڵگرین و چاوی لێ بکەین ..

ئایا ئەو باوکەی کە بەڵێن بە منداڵەکانی دەدات فلاّن شتیان بۆ بکڕێت و پاشـان وەفـادار نیـە بەرامبـەری ئایـا شـوێن پێـی پێغەمبـەری(ﷺ) هەڵگرتوە ؟

دەبینم خۆشەویست دەڵێیت : بەڵام هۆکار هەیە ... باروزروف بەو جۆرەیە ... ئەی باوکی خۆشەویست ... تۆ خۆت دەبێ باروزروفی خۆت بزانی ، تکایە بەڵێنێك بە منالّەکانت مەدە کە نەتوانی بەوەفا بیت بەرامبەری ، وە بزانە کە زۆر دووبارەبونەوەی بەهانەکان لای منداڵ دەبێتە درۆ.

یاالله ... خۆ وامانزانی بەوەفاین بەرامبەر بەڵێنەکانمان چونکە ئێمە بەهانەیەکمان دەهێنایەوە کاتێك دوادەکەوتین لە بەڵێن !! بەڵام دیارە پێویستە بەخۆماندا بچینەوە.

## چوارەم : وەفا بەرامبەر ئەوانەی چاکەت لەگەڵ دەکەن..

ئایا ئەوانەت لەیادە کە لە ژیانتدا چاکەیان لەگەڵدا کردویت ؟

ئایا ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرت لەوە کردۆتەوە کە بەوەفا بیت بەرامبەریان و چاکەیان بدەیتەوە !.

ئەگەر تاکو ئێستا وات نەکردوە لەئێستاوە دەست پێ بکە .

پێغەمبەری خوا (ﷺ)بەوەفا بوو بەرامبەر بێ باوەڕ ج جای مسوڵمانان! ئەمەش بەسارهاتێکی زۆر سەیر و تاك لە وەفای پێغەمبەر (ﷺ) پاش دە ساڵ تەنانەت لەگەڵ بێ باوەڕدا:

کاتێك ئەزیەت و ئازار لەسەر موسوڵمانەکان لە مەککەدا ڕوی لە زیادی کرد ... پیاوێك هەبوو ناوی ( ئەبوبختری کوڕی هیشام )بوولە

گەورەکانی قوڕەیش بو بەڵام لە ڕۆژێ لەو ڕۆژانەدا هەڵویستێکی زۆر مەردانەی هەبوو وە پاڵپشتی موسوڵمانانی کرد ئەگەر چی موسوڵمانیش نەبوو ..

ڕۆژان ڕویشتن ، پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە ، نزیکەی دەساڵ بەسەر ئەم هەڵویستەدا تێپەڕ بوو ، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) بەوەفایە و ئەوانەی لەیاد ناچێ کە چاکەیان لەگەڵدا کردووە ، جەنگی بەدر هاتە پێشەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) بەناو هاوەڵاندا بانگی کرد:

( هەر کەس بە ئەبوبختری گەیشت نەیکوژێت ، لەبەر ئەوەی لە مەککە بەو جۆرە لەگەڵماندا بوو.. )

لەمیانەی جەنگەکەدا لەپڕ یەکێك لە هاوەڵان ئەبو بەختری کەوتە بەر چاو ئاسایی‌یە کە بیکوژێ ، ئەو بێ باوەڕە و هاتووە بۆ کوشتاری موسوڵمانەکان ، بەڵام نا .. هاوەڵانیش بەوەفان ... هاوەڵەکە وازی لەو هێنا و کەوتە شەڕ لەگەڵ یەکێکی تر ، ئەبوبختری سەری سوڕما ! بۆچی وازی لێ هێنا ؟ لە هاوەڵەکەی پرسی بۆچی وازت لێ هێنام ئەویش ۆتی : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردوین کە نەتکوژین ، گوتی بۆچی ؟ هاوەڵەکە فەرمووی : وەك وەفایەك بۆ ئەوەی کە لە مەککەدا و بە تایبەت ڕۆژی لاپەڕەکەدا لەگەڵ ئێمەدا کردت ، ئەبوبختری وەتی : دەکە وایە ئەمەش مەکوژە ، هاوەڵەکە فەرمووی : نەخێر چونکە (ﷺ) تەنها ناوی تۆی هێناوە ، ئەبوبختری ووتی : دە من بکوژن ، هاوەڵەکە فەرمووی: وازت لێ دەهێنم ، ئەبوبختری چووە پشتی هاوەڵەکەوە و خەریك بوو بیکوژێت ، هاوەڵەکە ئاوڕی دایەوە و کوشتی ، ئیتر بە شپرزەیی و ترس و لەرزەوە چوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)ووتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر ئەو

نەیویستایە من بکوژێت من ئەم دەکوشت ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی خوا لێت خۆش بێت. قورتبی ڕیوایەتی کردوە.

خوێندنەوەی یەکەمی چیرۆکەکە خوێندنەوەیەکی ئاسایی‌یە ، چونکە پێت خۆشە کۆتایی‌یەکەی بزانی ، بەڵام من حەز ئەکەم جارێکی تر بیخوێنیتەوە و ئەم جارە ڕەوشتی وەفای تیا ببینی ..

دان نان بە هاوکاری و یارمەتی دەوروبەر و بەرامبەر پێویستە ، ئەگەر پاش دە ساڵیش بێت ، ئەم نمونەیە بکەرە سەرمەشقی ژیانت .

## وەفا بەرامبەر ئەوانەی فێریان کردویت..

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حنبل دەفەرموێ:

( ما بت منذ ثلاثين سنة إلا وأنا استغفر للشافعي ، و ادعوا له )

واتە: سی ساڵە هەمو ئێوارەیەك داوای لێخۆشبون بۆ پێشەوا شافیعی دەکەم و دۆعای بۆ دەکەم .

سەیری وەفای بەردەوام بکە ، بەڵێ ئەوە وەفای ئەو دڵە زیندوانەیە کە هەرگیز ئەوانەیان لەیاد ناچێ کە سودیان لێ وەرگرتون.

گوێ بگرە بۆ قوتابی‌یەکی ئەبو حەنیفە کە دەفەرموێ:

( و الله انی لادعو لأبی حنيفة قبل والدی فی الصلاة ).

واتە: سوێندبەخوا من لە نوێژەکانمدا پێش باوکم نزا بۆ ئەبوحونیفە دەکەم.

ئەمە چ وەفایەکە ؟ پێش دایك و باوك ؟! ئەمە شتێکی ئاسایی نیە چونکە ئەو لە ئەبوحەنیفەوە فێر بووە ، کاتێك دەفەرموێ:

( ما مددت رجلي نحو دار استاذي حماد وفاء له ، و ان بين بيتي و بيته لسبع سكك ).!

واتە: قاچەکانم هەرگیز ڕووەو ماڵی (حماد) ی مامۆستام درێژنەکردوە ، وەك وەفایەك بۆی ، لەکاتێکدا لەنێوان ماڵی ئێمەو ئەواندا حەوت کۆڵان هەیە .

یاالله ... هەوڵ بدە بیهێنەرە پێش چاوی خۆت ، ئەوە وەفاو ڕێزە ...

کوا وەفای تۆ بەرامبەر مامۆستاکانت؟ بچۆ بۆ قوتابخانە سەرەتاییەکەت ، سڵاو لە مامۆستاکانت بکە و سوپاسیان بکە لەسەر ئەوەی کە پێی گەیشتووی ئەوە وەفایە بەرامبەریان ، وەفایەکی زۆر سەرەتایی وە هەروەها قوتابخانەی ئامادەیی ... هەروەها ئەوانەی کە لە ڕێگەی خوادا دەستیان گرتووی ، ئەوەی کە فەرموودەیەکی فێر کردووی ، ئەوەی ئایەتێکی پێ لەبەر کردووی ... بە وەفا بە .

## وەفا لەگەڵ دایك و باوك..

لەپێشترین کەس کە چاکەیان لەگەڵ کردووی دایك و باوکە ... ئێمە ناتوانین حەقی خۆیان بدەینەوە ... بەڵام بەپێی توانا هەوڵ دەدەیت.. نیەتێکی چاکیش فریامان دەکەوێت ..

پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و ووتی:

ئەی پێغەمبەری خوا من دایك و باوکم وەفاتیان کردووە ، ئایا شتێك هەیە لە دوای وەفاتیان بتوانم بۆیان بکەم و چاکە بێت بۆیان ؟.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

( بەڵێ: نزا و پاڕانەوە بۆیان ، داوای لێ خۆش بون بۆیان ، جێبەجێ کردنی بەڵێنەکان بۆیان ، سەردانی خزم و کەسەکانیان ، ڕێزگرتن لە هاوڕێکانیان ). ئەبو داوود ڕیوایەتی کردوە.

خۆشەویستان :

ئەم ئامۆژگاریانە بۆ دوای وەفاتیانە !! سوێند بەخوا وەفاداری لە پێش وەفاتیان دا زۆر لەمە گەورە ترە ... بەڵێ دەزانم کە هەیە وەفادار بووە لە بەرامبەر دایك و باوکیدا لە کاتێکدا کە لە ژیاندا بوون ، وە چاك بووە بە پێی توانا ، بەڵام ( دایك ، باوك ) ووشە ناتوانێ ئاماژە بە هەموو ئەو شتانە بدا کە پێشکەشیان کردووە ... بە هەمان شێوە ووشە ناتوانێ ئاماژە بە چۆنیەتی وەفا بکات بەرامبەریان ... بەڵام پێنج شت هەیە کە دەتوانین ئەنجامیان بدەین و بەمەش بەوەفا بین بەرامبەریان لە دوای مردنیشیان :

١ – دوعاو پاڕانەوە . ٢- داوای لێ خۆش بون . ٣- جێبەجێ کردنی پەیمانەکانیان . ٤- سەردانی کەس و خزمانیان . ٥- ڕێزگرتن لە هاوڕێکانیان .

ئەگەر دەتەوێ وەفادار بیت بەرامبەر دایك و باوکت ئەم پێنج شتە جێبەجێ بکە .

## وەفا بەرامبەر پولیسی هاتوچۆ!

ئەوانەی کە چاکە دەکەن بەرامبەرمان زۆرن ... وە بێ گومان دەبێ وەفاداربین بەرامبەریان ... پۆلیسی هاتوچۆ کە هاتوچۆ ڕێك دەخات و هاوڵاتیان لە مەترسی دەپارێزێت ، ئەگەر دەتەوێ بەوەفا بیت بەرامبەری ، ئەوا سەرپێچی یاساکانی هاتوچۆ مەکە و ئاماژە یاسایی‌یەکانی سەر شەقامەکان مەشکێنە .

یاالله ... ناتوانین دەستنیشانی هەموو ئەوانە بکەین کە فەزلیان بەسەرمانەوە هەیە ، بەڵام خوا پشت و پەنایە ... هەموو یەکێك کە لەم

ولاٌتەدا خزمەت دەکات پێویستە ڕەچاوی ماندووبوون لە کارەکانیان بکەین و وەفامان هەبێ بەرامبەریان ... ئەمە باسێکی گەورەیە تەنها داوای ڕەوشتی جوان و لەسەر و هەموشیانەوە وەفاداری دەکات.

## پێنجەم : وەفا بەرامبەر هەموو ئەوانەی کە لەگەشتی تەمەنتدا دەیانناسی..

کۆتا جۆر لە جۆرەکانی وەفا بریتیە لە وەفا بەرامبەر هەموو ئەوانەی کە لە بەشە جیاجیاکانی تەمەنتدا ناسیوتن هاوڕێکانت لە قوتابخانە ... هاوڕێکانت لە زانکۆ و دراوسێکەت کە بەیەکەوە گەورە بوون ... ئامان نەکەی کەرتی ڕوحت هاوڕێی ژیانت لەیاد بکەی ئەویش خێزانەکەت یان هاوسەرەکەتە !

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ :

﴿ ان احق الشروط ان توفوا ما استحللتم به الفروج ﴾. بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

واتە: ڕاسترین مەرجو پەیمان کەپێویستە بەوەفابن پێوەی ئەوانەن لەسەری گرێبەستی هاوسەریتان پێوەگرێداوە .

بەلێ بە ڕاستی ڕاسترین و لە پێشترین مەرج ... ئایا بەوەفا بووی بەرامبەر مارەیی ؟ ئایا بەوەفا بووی بەرامبەر پلە و پایەی هاوسەرێتی ؟ ئایا بە وەفا بوی لە چاکی مامەلەتدا ؟.

ئامان نەکەی لێی بدەی ...؟ نەکەی ئەزیەتی بدەی ... نەکەی درۆی بەدەمەوە بکەی ... نەکەی ڕێگری بکەی لەوەی سەردانی کەس و کاری بکات ...

دەترسم لەیادت چووبێت بەوەفا بیت بەرامبەر بەو ڕەوشتانەی کە ئاماژەمان پیێ کرد ؟
ئایا یادت هاتەوە ؟ بەڵێ وەفاداری لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە لەگەڵیاندا ژیاوی هەست بەمە دەکەیت ؟ ڕەوشتی وەفاداری نوقمی جوانیەکانی خۆی کردین ... ئەم هەستە نیعمەتێکە لە خواوە و پێویستی بە سوپاس گوزاریە .

## بۆ بزەی لێوان..

یەکێك لە هاوەڵان خێزانەکەی هەمیشە دەنگی بەسەردا بەرز دەکردەوە ، ئەمەش بێزاری کرد ، بۆیە ووتی : سوێند بەخوا دەبێ شەکوای خۆم ببەمە لای ئەمیری بڕواداران عومەری کوڕی خەتتاب..بەرەو ماڵی ئەمیر ڕۆیشت ، بەڵام گوێی لە شتێکی سەیر بوو ، ئەوە دەنگی خێزانی ئەمیری مسوڵمانانە بەرزبۆتەوە بەسەریدا ، بینی حاڵی ئەمیری بڕوادارانیش وەکو حاڵی ئەو وایە بۆیە لە دەرگاینەدا و ویستی بگەڕێتەوە ، لەو کاتەشدا ئەمیری بڕواداران ویستی بێتە دەرەوە تاکو خێزانەکەی کەمێك ئارام بێتەوە و پاشان بگەڕێتەوە ... لە هاتنە دەرەوەی دا ئەم هاوەڵەی بینی ، پێی ووت: چیت ئەوێت ؟
ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە و ووتی: ئیتر وتومە ئەگەر ئەمە حاڵی ئەمیری بڕواداران بێت ئیتر من چی ؟
عومەری کوڕی خەتاب چەند ووشەیەکی فەرموو کە وەفای تیادا بەرجەستە بوو ... ووتی:

( ئارامگرە بەرامبەرم ... منداڵەکانم بۆ بەخێو دەکات ... جلەکانم بۆ دەشوات ... ماڵەکەم بۆ پاك دەکاتەوە... فەرمانیشی پێ نەکراوە کە وا بکات ... بەڵام ئەو دەیکات و ئارام دەگرێ ... ئایا من ئارام نەگرم کە دەنگی بەرز دەکاتەوە )؟!!

وابزانم ئەمە تازە نیە ... وابزانم تێ گەیشتی دەڵێم چی !؟

خێزانی هاوەڵێك دەنگ بەرز دەکاتەوە بەسەریداو هەروەها ئەمیری باوەڕدارانیش ... دەتۆش ئارام بگرە ...

سەیری وەفای عومەری کوڕی خەتتاب بکە .. کێ لە ئێمە وەکو ئەو دەکات؟

باشی و گەورەیی و فەزڵەکانی هاوسەرەکەی دەژمێرێت و ، بە وەفایە بەرامبەر مافەکانی .

## ئەمە چ وەفایەکە ؟!!

قەڵەم تیا مابوو خۆشم لە گەڵیدا .... ئایا هەموو حاڵەتەکانی تایبەت بە وەفاداری پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کۆبکەمەوە و بەیەکەوە بیان نوسم یان هەر بەشەو لە شوێنی گونجاوی خۆیدا دایبنێم .. سەیری وەفای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾بکەن پاش وەفاتی خاتوو خدیجە بە چوادە ساڵ ، ڕۆژی فەتحی مەککە ... ئەو ڕۆژە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سەرقاڵە ... هەموو دەیانەوێ قسەی لەگەڵدا بکەن ... هەیانە دەیەوێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ داوای لێخۆشبونی بۆ بکات ... هەندێکی تر سەبارەت بە باسێك دەیانەوێ پرسیاری لێ بکەن ... بەڵام پیرەژنێك دەبینێ بۆ لای دێ واز لە هەموویان دەهێنێ ... عەباکەی سەرشانی دادەخات و لەسەری

دایدەنیشێنێو نزیکەی کاتژمێرێك بەیەکەوە قسەیان کرد ، هەموو ئەمانەو کەسێکیش هەیە چاودێری دەکات ، ئەزانن کێیە ؟ خاتوو عائیشە ، کاتێك تەواو بوو ، پرسی ئەمە کێ بوو ئەی پێغەمبەر خوا(ﷺ)؟ فەرمووی ئەمە هاوڕێی خەدیجە بوو، لەوکاتانەدا سەردانی دەکردین ، خاتوو عائیشە فەرمووی : باسی چیتان دەکرد ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی : یادی ڕۆژەکانی ڕابردوومان دەکردەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی ڕۆژە جوانەکانی سەردەمی خاتوو خەدیجە بوو ، لێرەدا خاتوو عائیشە غیرە گرتی و فەرمووی : تا ئێستاش هەر یادی ئەو پیرەژنە دەکەیت کە گڵ دایپۆشیوە و خوای گەورە بۆی گۆڕیوی بە باشتر ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :

( نا سوێند بەخوا هەرگیز خوای گەورە لەو باشتری پێ نەداووم.........) ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

یاالله ئەمە چ وەفایەکە ؟!! بەڕاستی دینێکی گەورەیە نەکەی خیانەت و غەدر لە خێزانەکەت بکەیت ...

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەموێ:

﴿ ایما رجل تزوج امراة علی ما قل من المهر او کثر و لیس فی نفسه ان یؤدی الیها حقها خدعها ، فمات لقی الله و هو زان ﴾ .تەبەرانی ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هەر پیاوێك ئافرەتێکی کردە هاوسەر لەسەر بڕەمارەییەك ئیتر زۆربێت ئەویرە یان کەم، بەڵام لەنیازیدا نەبو ئەو مافەی بداتێ وفریویدا، ئەوجا کۆچی دوایی کرد، ئەوا بەزیناکارلەبەردەم خوای گەورە دا دەوەستێنرێت !!**

بڕوانە دەستەواژەیەك کە پێغەمبەر (ﷺ) هەڵیبژاردوە:

﴿ و لیس فی نفسه ﴾

ئێستا نەفسی خۆت بدوێنە لەسەر ئەم باسەو بگەڕێ بە دوای وەڵامێکی گونجاودا ... فەرموودەکە توندە ... ئێستا لەیادت بێت کوا وەفات بەرامبەر هەر کەسێك کە لە ژیانتدا ناسیوتە ؟ هاوەڵە کۆنەکانت ... بڕۆ سەردانیان بکە ... هەواڵیان بزانە ئەگەر بە تەلەفۆنیش بێت ... دەی ئێستا بێ دوو دڵی ئەم کارە بکەو لە یادیشت بێت نیەت تیایدا وەفاداریە .

## نا ئەی عباس ئەمڕۆ ڕۆژی چاکە و وەفاداریە..

بزانە ... وەفا داواکراوە بۆ هەرکەسێك کە لە ژیانتدا دەی ناسی ، تەنانەت ئەگەر خۆشیشت نەوێت !

فەرموو بۆ ئەم چیرۆکە ..

کلیلی کەعبە لای ( بني عبدالدار ) بوو ، عوسمانی کوڕی تەڵحەش هەر لەو خێڵە بوو ، کۆمەڵێك لە سەرانی قوڕەیش لەناو کەعبە بوون ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ( ئەی عوسمان : ئەم کەیتە ژوورەوە ؟ ووتی : نەخێر ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەی عوسمان لەوانەیە ڕۆژێك بێت کلیلەکە بە من بێت و ئەو کاتە نایدەم بە تۆ ... ) عوسمان ووتی : ئەگەر ئەو ڕۆژە هات ئەوا ناوسکی زەوی بۆ من زۆر باشترە لەسەر زەوی ... پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ڕۆیشت و نەچووە ژوورەوە ، ڕۆژان ڕۆیشت و فەتحی مەککە کرا عوسمانی کوڕی تەڵحە موسوڵمان بوو ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:( عوسمان کلیلەکان لەکوێیە ؟ ووتی : لەماڵەوەیە ئەی پێغەمبەری خوا لای دایکم ... دەچم دەیهێنم ... ڕۆیشتەوە بۆ لای دایکی و بەسەرهاتەکەی بیر هێنایەوە ... ووتی دایکە کلیلەکانم بەرێ

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیەوێ ... پێغەمبەر (ﷺ) بینی عوسمان دواکەوت بۆیە عومەری کوڕی خەتتابی نارد بەدوایدا و پێی ووت بڕۆ کلیلەکەم بۆ بهێنە ... عومەر ڕۆشیت لە دەرگایدا ، ووتی : عوسمان کوا کلیلەکە ؟ خێرا کلیلەکەی لە گیرفانی دەرهێنا ( ئەوە عومەرە!! ) دایە دەستی و بردی بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وەریگرت .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی عوسمان بیرتە ئەو ڕۆژە چیم پێ ووتی ( پێ دەچێ لێت وەگرم و نەتدەمەوە )؟عوسمان بێدەنگ بوو ، پاشان عەباس هات( مامی پێغەمبەر (ﷺ)) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا کلیلەکەم بەرێ و با ئیتر لای خێڵی عبدالمتليب بێت . بەڵام پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: نا ئەی عەباس ئەمڕۆ ڕۆژی چاکە و وەفایە ... چاکە و وەفا ... بیبەن ئەی بەنیعبدالدار با هەتا هەتایە لەلای ئێوە بێت ، وە لێتان وەرناگرێ ستەمکار نەبێت. تەبەرانی ڕیوایەتی کردوە.

ئیتر کلیلەکەی دایەوە دەست عوسمان ..

هەتا ئەمڕۆش کلیلی کەعبە لای ئەو خێڵەیە و هیچ مەلیك و سەرۆکێك بە بێ ئیزنی ئەمان ناچێتە ناو کەعبەوە وەك وەفایەك بۆ وتەکەی پێغەمبەر (ﷺ).

ڕات چییە بەرامبەر ئەو هەڵوێستە؟ چیت دەکرد گەر تۆ لە جێگەی پێغەمبەردا(ﷺ) بویتایە ؟ قسە ئاسانە ، جیهانی قسە بێژانیش فراوانەو جێی هەمووان دەبێت ، بەڵام ئەی تۆ لە کوێیت ئەی جیهانی کارگوزاران ؟.

## ئاڵای ڕاستی هەڵکەو دامەزراو بە..

ئێستا ... ڕەوشتی وەفاداری کۆتایی پێ هات و زانیمان کە پێنج بەشی هەیە ... بەباشی ئەم ڕەوشتە وەگرە ... ئایا ناتەوێ و حەز ناکەیت ئاڵایەك بۆ ڕاستی هەڵکەیت ؟

کەواتە ئاڵای وەفاداری هەڵکە لە هەموو جێیەك ، بەردەوام و دامەزراو بە لەسەری ، پێت پتەو بکە ... بزانە کە وەفاداری ڕوکار و هەڵوسوکەوتی مرۆڤ جوان دەکات ... خوای گەورە کاتێك دەیەوێ ستایشی گەورەمان ئیبراهیم بکات دەفەرموێ:

﴿ وَإِبۡرَٰهِيمَ ٱلَّذِي وَفَّىٰٓ ﴾ النجم: ٣٧

**واتە: ئەو ئیبراهیمەی کە هەموو پەیمانەکانی بەجێهینا بەتەواوی .**

بەوەفابە بەرامبەر هەموو بەشەکانی وەفا ، بەوەفابە بەرامبەر بەوەی کە دەتوانیت بەوەفا بیت ، هەوڵ بدە ... چونکە من وا هەست دەکەم تۆ ئێستا و لەمەودوا هەوڵ دەدەیت وەفادار بیت چونکە زانیت کە چۆن دەتوانی وەفادر بیت ، بەرامبەر ئەوانەی کە چاکەیان لەگەڵ کردوویت ... لە بیرت بێت وەفادار بە بەرامبەر ئەم پەڕاوەش ..



##  حـــــەیا

### ئێمە ئەمڕۆ زۆر پێویستمان بەم ڕەوشتە هەیە ..

یەکێکە لە ڕەوشتە زۆر گرنگەکان ... ڕەوشتێکی کاریگەرە لەسەر تاك و خێزان و کۆمەڵگە ... ڕەوشتێك کە لەم سەردەمەدا زۆر غەریبە ... ئەو وەختەی کە لەدەستمان چوو کۆمەڵگە پیس بوو .

ڕەوشتێك هەر کات زیاتر پێوەی پەیوەست بین و دەستی پێوە بگرین کۆمەڵگە زیاتر پاکتر دەبێت وە هەر کاتێکیش لێی دوور کەوتینەوە ، کێشەکان لە کۆمەڵگەدا زیاد دەبن .

ئەویش ڕەوشتی حەیایە ... گرێدراوی باوەڕە و بە زیادبوونی ئیمان زیاد دەکات و بە دابەزینی ئیمان دادەبەزێ .

### حەیا واتای چیە ؟

هەندێك جار دەبیستین کە فلان کەس زۆر بە حەیایە ، مەبەستمان لە حەیا چیە ؟

حەیا واتە : گرتنی نەفس ، نەفس ناتوانێ کاری سوك و ناپەسەند بکات چونکە مرۆڤی بەحەیا ناتوانێ خۆی بە ڕیسوایی ببینێ لەبەردەمی خوای گەورەدا ، لەبەردەمی خەڵکیدا ، تەنانەت لەبەردەمی خودی خۆیشیدا.

ڕەوشتی باوەڕدار

کەسی بەحەیا نەفسێکی بەڕێزی هەیە ، کەسی بەحەیا ڕێز لەخۆی دەگرێ ، لەبەردەمی خوادا ، لەبەردەمی خەڵکیدا ، لەبەردەمی خودی خۆیدا .

## وەك بڵێی هەست و سۆزێکی زیندووە..

لەم پێناسەیەی پێشەوەدا دەبینی کە حەیا وەك هەست و سۆزێکی زیندوو وایە لەناو نەفسدا ... سۆزێك کە دەروون بەرز دەکاتەوە لە ئاست دنیا و شتە بچوکەکاندا..

سۆزێك کە هەندێك ووشە دەباتە قاڵبی موستەحیلەوە وەك :

( گوناه ، هەڵە ، غەش ، فێڵ ، دزی ، زینا ).

وەزمانحاڵی ئەو سۆزە دەڵێت : من زۆر لەوانە بەرزترم .

## حەیا لە ژیانەوەیە ..

بنچینەی ووشەی ( حیاء ) لە ( حیاة ) وەیە ، لەبەرئەوە دەڵێن:

( پیاوەکە حەیای هەیە ) واتە لە بەهێزی ترپەکانی ژیان لە ناوەوە ، شەرم دەکات لەوەی کە بکەوێتە حاڵەتێکی سوکی و ڕیسوایییەوە ، چونکە زۆر بە حەیایە .

فلان کەس دڵی زیندووە بۆیە ناتوانێ کاری بچوك ئەنجام بدات .

چاوەڕێی چی دەکەیت ئەگەر دڵ مرد ؟.

پەیوەندی نێوان ژیانی دڵ بە تایبەتی و حەیا بەگشتی پەیوەندییەکی پتەوە ، چەندە دڵ زیندوو بێت ، هێندە حەیا زیاتر دەبێت ، خۆ ئەگەر دڵ مرد ...! کارەکە کۆتایی پێ دێت چونکە بە مردنی دڵ ئەو سۆزەش

دەمرێت ، ئەوکات هیچ پیسێك بە پیس نازانێت و هیچ نزمێك بە نزم نازانێت .
بۆیە دەبینیت دەتوانێت گوناه بکات . ژیانی وەك ژیان نامێنێت ...
ڕاستی ووتوە ئەوەی کە دەڵێ :
( ئەو کەسەی کە تەواوترین ژیانی هەیە ئەو کەسەیە کە تەواوترین حەیای هەیە ).

## ئایا جیاوازی هەیە لە نێوان شەرمەزاری و حەیادا ؟

زۆرێك وا گومان دەبەن حەیا واتە چونەوەیەك و شەرمەزاری ...!! بەڵام جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان ئەم دووانەدا .
شەرمەزاری هەروەك زانایانی دەروون پێناسەی دەکەن بریتییە لە : شپرزەییەك کە بەهۆی هەڵوێستێکەوە توشی مرۆڤ دەبێت..
وەك:پرسیاری مامۆستا لە قوتابییەکەی..دەبینی قوتابییەکە شەرمەزار دەبێ و ناتوانێ بەباشی باسی بیر و بۆچونی خۆی بکات.
شەرمەزاری لە ترسنۆکییەوە سەرچاوە دەگرێت . لە ترسەوە سەرچاوە دەگرێت ، کەسێتی شەرمەزار کەسێتیەکی لاوازە ... کەسێتیەکە بەهای خۆی نازانێ ، بەڵام حەیا پێچەوانەی هەموو ئەوانەیە ، حەیا لە کەسێتییەکی بەهێزەوە سەرچاوە دەگرێت ، کەسێتیەك کە بەهای خۆی دەزانێ ، خۆی زۆر لەوە بەگەورەتر دەزانێ کە گوانە و شتە ناپەسندەکان بکات.
سبحان الله! ئێمە والگومانمان دەبرد کە حەیا و شەرمەزاری دوو وشەی وەکو یەکن بەڵام ئێستا دەرکەوت کە بەڵکو دژی یەکیش

## تێگەیشتنێکی هەڵە...!!

ئێمە ئێستا دوای ئەوەی ئەو جیاوازییە گەورەیەی نێوان حەیا و شەرمەزاریمان زانی ، دەتوانین کە ڕاڤەی زۆرێك لە هەڵسوکەوتە هەڵەکان بکەین وەك :

دەبینی مافی خوراوە کەچی هەوڵ نادات بۆ سەندنەوەی ... کاتێك پێی دەڵێی بۆچی بێ دەنگی لەسەر حەقی خۆت ؟ لە وەڵامدا دەڵێ: من زۆر شەرمنم بەڕاستی !.

ئەوە شەرمەزاریەو حەیا نیە ، چونکە ئەگەر بەحەیا بوایە داوای حەقی خۆی دەکرد .

## ئەمە چ بەڵگەیەکە ؟

ئەمە کۆمەڵێك لە فەموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە باس لە ڕەوشتی حەیا دەکات ، دواجار ئەم دەرەنجامەت دەست دەکەوێت کە :

**حەیا گەورەترین و گرنگترین ڕەوشتە ..**

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿ الایمان بضع و ستون شعبة . والحیاء شعبة من الایمان ﴾ بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: باوەڕ حەفتاو ئەوەندە ( سێ تا نۆ ) لقە ، چلەپۆپەکەی ( لاإلـه الا الله ) یـەو شەرمکردنیش لقێکە لەباوەڕ.**

سبحان الله ... ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە حەیا دەستت دەگرێت بۆ شەست بەش و ئەوەندەکەی تر ...لە گێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

﴿ الآيمان بضع و سبعون شعبة اعلاها لا اله الاالله ، واوناها اماطة الآذى عن الطريق والحياء شعبة من الآيمان ﴾.

**واته: باوەڕ حەفتاو ئەوەندە ( سێ تا نۆ ) لقە ، چڵەپۆپەكەی ( لاإلـە الا الله ) یـەو خوارینەكەیشی لابردنـی پیـسی و شـتی ئـازاردەرە لەسـەر شـەقام ڕێگاكـان، شەرمكردنیش لقێكە لەباوەڕ.**

**پاكو بێگەردی بۆ خوا .. حەیا بەشێكی سەرەكیە لە بەشەكانی باوەڕ .**

**دەی ... با بەخۆماندا بچینەوە ... ئایا ئێمە لە كوێین لە بەرامبەر ڕەوشتی حەیادا ؟**

## ڕەوشت دەگەڕێتەوە بۆ حەیا ..

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿ الحیاء كله خیر ﴾ .موسلیم ڕیوایەتی كردوە.

**واتە: شەرمكردن هەمووی خێر و چاكەیە.**

**هەروەها دەفەرموێ(ﷺ):**

﴿ الحیاء لا یأتی الآ بخیر ﴾ .بوخاری ڕیوایەتی كردوە.

**واتە: شەرمكردن تەنها خێر و چاكە بەدوای خۆیدا دەهێنێ.**

**هەروەها دەفەرموێ(ﷺ):**

﴿ الحیاء من الآیمان و الآیمان فی الجنة ، و البزاء من الجفاء ، و الجفاء فی النار ﴾ .

ترمزی ڕیوایەتی كردوە.

**واتە: شەرمكردن لەباوەڕەوەیە، باوەڕیش لەبەهەشتایە، كاری خراپەو بێ شەرمانەیش لە جەفاوەیە( پشت تێكردن) جەفاكردنیش لەناو دۆزەخدایە .**

﴿ البزاء ﴾ **واتە: خوو و ڕەوشت خراپ ،** ﴿ الجفاء ﴾ **واتە:دڵ ڕەق و ڕەش .**

## ڕەوشتی باوەڕدار

**هەروەها دەفەموێ(ﷺ):**

﴿ الحياء و الإيمان قرناء جميعا إذا رفع احدهما رفع الآخر ﴾ . هندی ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: شەرمکردن و باوەڕداری هاودەموهاوشانی یەکترن، کەریەکێکیان هەڵگیراو نەما ئەوەی تریشیان هەڵدەگیرێت و نامێنێت .**

**فەرموودەکان باس لەوە دەکەن باشی بۆ کێیە ..!؟ باوەڕ بۆ کێیە ؟ ڕەوشت بۆ کێیە ؟ هەموو ئەمانە بۆ ئەو کەسەیە کە ڕەوشتی حەیای هەیە .**

**تۆ ناتوانی لەگەڵ دایك و باوکت چاك بیت یان بگەڕێیتەوە بۆ لای خوا یان حەج بکەی یان عەمرە بکەی ، یان ڕاستگۆ بیت و واز لە درۆ بهێنی یان سوور بی لەسەر بەندایەتی خوا ... یان ...یان...**

**مەگەر کەسێکی بەحەیا نەبی ... شەرم بکەی لەخوا لەسەر ئەم هەموو تاوانە ... شەرم بکەی لەوەی کە بەو شێوەیە بچیتەوە خزمەتی ...**

**لەبەرئەوە چاکە بکە لەگەڵ دایك و باوکت و بگەڕێرەوە بەرەو خوا و ڕاستگۆ بەو دامەزراو بە ...**

**بە ڕاستی ڕەوشت سەرچاوەکەی حەیایە.**

## واتایەکی جوان..

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿ ان لكل دين خلقاً و خلق الاسلام الحياء ﴾ .

**واتە: هەمو ئاینێك بەهایەکی ڕەوشتی هەیە ، بەهای ڕەوشتی ئیسلامەتیش شەرمکردنە .**

**دیاره ئەمە مانای ئەوە نیە کە ئیسلام جگە لە حیا ڕەوشتی تیا نیە ، بەڵام مانای ئەوەیە کە تەواوترین ڕەوشتی ئیسلام حەیایە !! سوێند بە خوا ئەمە واتایەکی جوانە ( ڕەوشتی ئیسلام حەیایە ) لە ئیسلامدا ڕەوشتێك نابینی بە قەدەر حەیا تەواو گەورە بێت .**

## فەرمودەیەك و دوو مانا..

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿ إن مما أدرك الناس من كلام النبوة الأولى: إذا لم تستحي فاصنع ما شئت﴾ .

**بوخاری ڕیوایەتی کردوە.**

**واتە: ئەوەی خەڵکی لەوتەو قسەی هەموپێغەمبەرانەوە (سەرەتای پێغەمبەرانەوە) فێربوە ئەمەیە: کە ئەگەر شەرمکردن ئەنجام نادەیت ، چیت لەدەستدێت ئەنجامی بدە !!**

**بەو مانایەی کە ڕەوشتی حەیا هەموو پێغەمبەران کۆکن لەسەری و نەسڕاوەتەوە ...**

**ئەم فەرمودەیە دوو مانای هەیە :**

**یەکەم : هەڕەشەیەك بەوەی کە گەر حەیات نیە چیدەکەی بیکە چونکە تۆ لەسنور دەرچووی ..**

**دووهەم : بەرەو پێشچون لە کارەکانتدا بەبێ شەرمەزاری..**

**ئەو کارەی دەی کەی دەزانی کە حەیای تیایە و تۆش خاوەنی دڵێکی زیندویت و هیچ تەمومژێکی بەسەرەوە نیە ، ئەوا بەرەو پێش بڕۆ و گوێ مەدەرێ .**

## ئامۆژگاریەك لە حەیادا .

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ جارێکیان بەلای پیاوێکی ئەنصاریدا تێپەڕی ئامۆژگاری براکەی دەکرد لەسەر حەیا – بە سەرزارەکی لە شتەکە حاڵی مەبە چاوەڕێ بە – ئامۆژگاری براکەی دەکرد لەسەر حەیا ، واتە ئامۆژگاری دەکرد بەوەی کە کەمێك لەو حەیایەی کە هەیەتی کەمی بکاتەوە لەبەر ئەوەی زۆر بەحەیا بوو، بەلاّم پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:

﴿ وعه فان الحياء من الأيمان ﴾. ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: وازی لێ بهێنە حەیا لە باوەڕەوەیە ..**

بیهێنە پێش چاوت ، ئەگەر ئەو هاوەڵەی کە ئامۆژگاری برای دەکرد ئێستا لەناوماندا بوایە دەبێ چۆن ئامۆژگاری خەڵکی بکردایە لەسەر حەیا .. !!؟.

## حەیای کچان بەو جۆرەیە ..!!

فاتیمەی کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە هاتە خزمەت پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ تاکو مسوڵمان بێت و بەیعەت بدات ... لەوکاتەدا دایکە عائیشەش لە خزمەت پێغەمبەردا بوو ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: ئەی فاتیمە بەیعەتم بدەرێ لەسەر ئەوەی کە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار نەدەی ...وە دزی نەکەی و وە زینا نەکەی ... کاتێك فاتیمە گوێی لەم قسەیە بوو ( زینا نەکەی ) یەکسەر دەستی گرت بە دەم و چاویەوە و دەستی دەهێنایە خوارەوە لەبەر زۆر بەحەیایی ، حەیاکەی لای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ زۆر جێی سەرنج بوو . خاتوو عائیشە فەرمووی : ئەی فاتیمە ، بەیعەت

بده ، ئافرەتان هەر لە سەر ئەمە بەیعەت دەدەن ، ئیتر فاتیمە بەیعەتیدا

تۆ لە کوێی ئەی فاتیمە چونکە ئێمە دەگەڕێین بە دوای کەسانی وەکو تۆدا لەم سەردەمەدا .

## یاالله ... تا ئەو پلەیە ؟!

خاتوو عائیشە دەفەرموێت :

دەچومە ژورەکەمەوە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ئەبوبکردا لەوێ ئەسپەردەی خاك کرابون ، بەخۆمم دەوت : مێردەکەم و باوکم ، ئیتر سەرپۆشەکەم لادەبرد ، بەڵام کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب وەفاتی کرد لەلایانەوە ئەسپەردە کرا ئیتر شەرمم دەکرد لەوەی کە سەرپۆشەکەم لابەرم وەك حەیایەك لە بەرامبەر عومەر!!.

بەلاتەوە سەیر نەبێت دڵی زیندوو بە حەیایە ... بەڵام سەیری حەیا بکە ، بەحەیایە بەرامبەر مردوو .!!

دەی .. حەیای خۆتی پێ پێوانە بکە ... دواتریش بزانە دەرەنجامەکەی چیە ؟.

## پیاوێك فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن ...!!

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

( چۆن شەرم نەکەم لە عوسمان !؟ ئەو پیاوێکە فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن ). موسلیم ریوایەتی کردوە.

## ڕەوشتی باوەڕدار

فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن ..!! لە ئەدەب و حەیای .. کێ لە ئێمە بەشێکمان لە حەیای عوسمانی کوڕی حەففان هەیە !؟

سوێند بەخوا من زۆر تامەزرۆی بینینی ئەو پیاوە گەورەیەم خوایە بمانخەرە بەهەشتەوە تاك و ببینین ..

گەر وەك ئەوان نین با وەك ئەوان بین چونکە شوێنکەوتنی ئەو پیاوانە سەرفرازیە.

## یەکێك لە کچەکان هات زۆر بەشەرم و حەیاوە دەڕۆیشت..

خوای گەورە وەسفی حاڵی یەکێك لەو ئافرەتانەمان بۆ دەکات کە بە گەورەمان موسی گەیشتن و فەرمووی:

﴿ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِى عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِى يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا ﴾ القصص: ٢٥

واتە: دوای ئاوێك یەکێك لە کچەکان هات بۆلای موسا زۆر بەشەرم و حەیاوە دەڕۆیشت بەڕێگەدا ، کەگەیشتە لای پێی ووت: باوکم بانگت دەکات و حەزدەکات پاداشتی ئەو چاکە و ئاودانی ماڵاتەکە بۆ ئێمەت ئەنجامدا بداتەوە .

یان ئەمجارە دەتوانی ئایەتەکە بەم جۆرە بخوێنیتەوە:

﴿ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِى عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ ﴾ ... ﴿ عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِى يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا ﴾ .

تێ گەیشتی مەبەستم چیە ؟ ... وا هەست دەکەی کە ڕۆشتنەکەی وقسەکەی هەر بە حەیاوە بووە..

## گەورەترین پلەی شەرم و حەیا..

باشترین و گەورەترین و پێویستترین حەیا ، حەیایە لە خوای گەورە ... ئێمە هەمومان پیاو و ئافرەت ... کوڕ و کچ گەورە و بچوك ... هەمومان هاوبەشین لە گوناهێکدا کە ئەویش نەبونی حەیایە بەرامبەر بە خوا ... تۆ کە دڵنیای وە دەزانی خوای گەورە چاوی لێتەو سەیرت دەکات بۆ چی ئەو تاوانەت کرد ؟.

## کاغەزەکانت سەرلە نوێ ڕێك بخەرەوە..

کارێکی بچوك نیەت گەورەی دەکات ، وەکارێکی گەورە نیەت بچوکی دەکاتەوە ، سەیرکە بزانە نیەت چی دەکات بە کردەوەکان ..!! ئێستا ئەمە لەیادکە تەنها پێشەکی‌یەك بوو بەڵام ئەمە مەبەست بوو:

هەندێك جار مرۆڤ تاوانێکی گەورە ئەنجام دەدات ، بەڵام پەشیمان بونەوەو تەوبە و ترس و شەرم لە خوا وا دەکات ئەو گوناهە دەکاتە گوناهە بچوکەکان ، وە هەندێ جاری تریش هەیە مرۆڤ گوناهێکی بچوك دەکات ، بەڵام نەبونی شەرم و حەیا بەرامبەر خواو نەترسان و چاو قایمی وا دەکات ئەم گوناهە لە گوناهە گەورەکان بنوسرێت !!

هەست دەکەم تۆ ئێستە شەرم دەکەی لەخوا . گەر وانەبێ زۆر خەتەرناکە ، وریای خۆت بە ، چونکە گەورەیی و بچوکی گوناه حەیات بەرامبەر بە خوا دیاری دەکات ..

دەبینم دوای ئەوەی کە گەورەیی و گرنگی و خەتەرناکی حەیات زانی ئێستە جارێکی تر کاغەزەکانت ڕێك دەخەیتەوە !!.

## ( ئیبن القیم ) ڕونی دەكاتەوە..

پزیشكی دڵان ( ابن قیم ) وتەیەكی جوانی هەیە لەسەر حەیا بەرامبەر خوا ، بەڵام پێش ئەوەی بیخوێنیتەوە لە هۆكارەكانی شیفا ڕاستگۆیی نەخۆشەكەیە لە باسكردنی حاڵەتەكانی خۆی بۆ پزیشكەكە !!

ئیبن القیم دەفەرموێ:

**( دڵخۆشیەكەت بە گوناھ لای خوا زۆر قورسترە لە گوناھەكە.**

**پێكەنینت لە كاتێكدا كە گوناھ دەكەی لای خوا قورسترە لە گوناھەكە .**

**دڵتەنگیت بە لەدەستچوونی گوناھێك لای خوا زۆر قورسترە لە گوناھەكە.**

**سوربونت لەسەر ئەوەی بەلاتەوە ئاسایی بێت گوناھێك بكەیت و دڵت ڕانەچڵەكێت بەوەی كە خوا چاوی لێتە ، لای خوا زۆر قورسترە لە گوناھەكە).**

ئای لەو ووشانەی چاوەكان فرمێسكیان بۆ دەڕێژن ....!!.

**شەرم لە خوا ناكەی..؟!!**

دەی .. ئێستە بڕیاری پاككردنەوەی دەروونت بدە بە پشتیوانی خوا.

## لە كەشكۆڵی زێڕینی پێشینانمان..

پیاوێك هات بۆ لای ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم و ووتی :

ئەی ئیمام دەمەوێ تەوبە بكەم و لە گوناھ دوور بكەومەوە ، بەڵام هەر دەگەڕێمەوە سەری ، كۆمەڵە شتێكم پێ بڵێ كە بمپارێزێ و نەكەومەوە بێ فەرمانی خواوە .

تۆ ئەمەت دەوێ ؟کێ لە ئێمە نایەوێت بگەڕێتەوە و واز لە گوناه و تاوان بهێنێ ؟ کەواتە وریابەو و بە جددی ئەم وتەیەی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وەرگرە !!

ئیبراهیم فەرمووی :

ئەگەر ویستت لە خوا یاخی بیت و گوناه بکەی ئەوە لەسەر زەوی ئەو ئەم کارە مەکە !!.

پیاوەکە وتی: ئەی لە کوێ لێی یاخی بم ؟.

ئیبراهیم فەرمووی: لە دەرەوەی زەویەکەی !!

پیاوەکە وتی : چۆن ئەی ئیمام لەکاتێکدا زەوی هەموو موڵکی خوایە ؟ ئیبراهیم فەرمووی : ئەی شەرم ناکەی لەسەر زەوی خوا لەخوا یاخی ببیت؟.

پاشان ئیبراهیم فەرمووی :

ئەگەر ویستت سەرپێچی فەرمانەکانی خوا بکەی ئەوە لە ڕزق و ڕۆزییەکەی مەخۆ ؟.

پیاوەکە وتی : ئەی چۆن بژیم ؟ .

ئیبراهیم فەرمووی: ئەی شەرم ناکەی لە ڕزقەکەی دەخۆیت و سەرپێچیشی دەکەیت ؟.

پاشان ئیبراهیم فەرمووی :

ئەگەر هەر دەتەوێ سەرپێچی خوا بکەی ئەوا لە جێگەیەك دا بیکە کە خوا نەتبینێ!

پیاوەکە وتی : چۆن شتی وا دەبێ لەکاتێکدا ئێمە لەهەر جێگەیەك بین خوامان لەگەڵدایە ؟

## ڕەوشتی باوەڕدار

ئیبراهیم فەرمووی : ئەی شەرم ناکەی سەرپێچی دەکەی لەکاتێکدا ئەو زاتە نزیکە لێتەوەو لە گەڵتدایە ؟

پاشان ئیبراهیم فەرمووی : ئەگەر هەر دەتەوێ سەرپێچی فەرمانەکانی خوا بکەی ، هەر کات (فریشتەی گیان کێشان) هات بۆ ئەوەی ڕوحت بکێشێ پێ بڵێ : چاوەڕێم بکە هەتا تەوبە دەکەم !!

پیاوەکە وتی : جا کێ دەتوانێ کاری وا بکات ؟!

ئیبراهیم فەرمووی : ئەی شەرم ناکەی(فریشتەی گیان کێشان) بێت گیانت بکێشێت و تۆ لەسەر گوانە و تاوان بیت ؟

پاشان ئیبراهیم فەرمووی : ئەگەر هەر دەتوێ گوناە بکەیت ئەوا لە کاتێکدا ئەگەر ( زبانیە )ی دۆزەخ هاتن بۆ ئەوەی کێشت بکەن بۆ ناو ئاگر پێیان بڵێ ، نایەم لەگەڵتاندا !!.

پیاوەکە وتی : شتی وا چۆن دەبێ ئەی ئیمام؟!

ئیبراهیم فەرمووی : ئایا لە پاش هەموو ئەمانە شەرم لە خوا ناکەیت ؟!! ئێستە جارێکی تر ئەم بەسەرهاتە بخوێنەرەوە و کەسەکە بگۆڕە بە کەسێکی تر ... ئەویش خودی خۆتی ... وە پاش خوێندنەوە ئەم پرسیارە لە خۆت بکە:

ئایا شەرم لە خوا ناکەیت ...!!؟

سەیری ڕەحمەتی خوا بکە بەرامبەرت و شەرمی لێ بکە..

پاش هەموو ئەمانە شەرم ناکەی لە خوا؟

ئەگەر هەر دەتوێ سەرپێچی فەرمانەکانی خوا بکەیت لەمانە ڕامێنە : سەیری ڕەحمەتی خوا بکە بەرامبەرت تا فێری حەیا بیت ... سەیری لوتف و مەرحەمەتی بکە بەرامبەرت .

خوای گەورە لە فەرمودەیەکی قودسی‌دا دەفەرموێ :

﴿ اني و الانس و الجن في نبأ عظيم . اخلق و يعبد غيري . ارزق و يشكر سواي . خير الى العباد نازل و شرهم الى صاعد . اتودد اليهم بالنعم و انا الغني عنهم ، و يتبغضون الى بالمعاصي و هم افقر ما يكونون الى ، اهل ذكرى اهل مجالستي . من اراد ان يجالسني فاليذكرني . اهل طاعتي اهل محبتي . اهل معصيتي لا اقنطهم من رحمتي ، ان تابوا الى فأنا حبيبهم ، و ان ابوا فأنا طبيبهم ، أبتليهم بالمصائب لأطهرهم من المعايب . من أتاني منهم تائبا تلقيته من بعيد ، و من أعرض عني ناديته من قريب ، اقول له اين تذهب ؟ الك رب سواي ؟ الحسنة عندي بعشرة امثالها و ازيد . و السيئة عندي بمثلها و اعفو . و عزتي و جلالي لو استغفروني منها لغفرتها لهم ﴾.

**واتە: من ومرۆڤو پەرییەکان لەدەنگوباسێکی مەزنداین! من بەدیهێنەرم وجگەلەمن پەرستشی بۆدەکرێت!! من ڕۆزی دەرمو سوپاسی جگە لەمن دەکرێت! خێرم بۆ بەندەکان دەبارێت، شەڕی ئەوان بۆلام بلند دەکرێت!! خۆمیان لاشیرین دەکەم بە بەخشینی نازو نیعمەتەکانم، لەکاتێکدا بێ پێویستم لێیان!! ئەوانیش خۆیان ناشیرین دەکەن لام بە تاوانو گوناهەکانیان لەکاتێکدا زۆر پێویستی یان پێم هەیە، . خەڵکی زیکرو یادی من ئەهلی مەجلیسی منن، هەرکەسێك دەیەوێت لەمەجلیسی مندا بێت با یادی من بکات ،خەڵکی گوێڕایەڵی فەرمانەکانم ئەهلی خۆشەویستی منن، خەڵکی تاوانکاریش مەئیوسیان ناکەم لە ڕەحمەتم، گەرتەوبە بکەنو بگەڕێنەوەلام ئەوە من خۆشەویستی ئەوانم، گەر سەرکەشی بکەن من پزیشکیانم، بە ناڕەحەتیەکان تاقییان دەکەمەوە تا لەهەڵەکانیان پاکژیان بکەمەوە،هەرکەس لەوان بگەڕێتەوە لامان هەرلەدورەوە وەریدەگرمەوە!!ئەوەیشی پشتمان تێبکات لەنزیکەوە بانگی دەکەمەوە،پێی دەڵێم: بۆکوێ دەچیت! جگەلەمن خوایەکی دیکەت دەست دەکەوێت! چاکە لای من یەك بە دەیە زیاتریشی دەکەم!! خراپەش هەروێنەی خۆی لەسەرتان تۆماردەکرێت**

**یاخود لێتان خۆش دەبم !! سوێن بە گەورەیی و مەزنی خۆم ئەگەر داوای لێبوردنم لێبکەن لەهەڵەکانیان ئەوا بەدڵنیاییەوە لێیان خۆشدەبم !!**

**ئەگەر دڵت پاکە ... زیندووە .... ئەوا دەگری پاش ئەم وتانەی خوای گەورە ... ئایا پاش ئەم هەموو ڕەحمەتە ... حەرام دەخۆی ، بۆ حەرام دەڕوانی ... درۆ دەکەی .... فێڵ دەکەی ... خیانەت لە ئەمانەت دەکەی ، نوێژ ناکەی ، لە خوا ناترسی ، بالاپۆش نابیت ...**

**پاش ئەم هەموو ڕەحمەتە شەرم لە خوا ناکەیت ...**

**ئەگەر ئەمەش نا ، بفەرموو بۆ ئەمەش :**

**لە ئەسەردا هاتووە کە :**

﴿ ان الله تبارك و تعالى نادى داوود : يا داوود لو يعلم المدبرون عني شوقي لهم و حبي لهم و رغبتي في عودتهم لطاروا شوقا الي . يا داوود : هذه رغبتي بالمدبرين عني فكيف حبي للمواقبلين علي ﴾ .

**واتە: خوای گەورە بانگی داوودی کرد: ئەی داوود ئەگەر ئەوکەسانەی پشتیان تێکردوم ئەیان زانی چەندە بەشەوقم بۆیان وچەندەم خۆشدەوێن و چەندەم پێخۆشە بەگەڕانەوەیان، ئەوا لەخۆشیا دەفڕین بۆلام ،ئەی داوود ئەگەر ئەمە حەزو شەوقی من بێت بۆ ئەوانەی پشتیان تێکردوم ئەی دەبێت خۆشەویستی من چەندەبێ بۆ ئەو کەسانەی ڕوی دڵو دەرونیان لەمنە !!.**

**هەموو ئەمانەو واش لەخوا یاخی دەبیت و شەرمی لێ ناکەیت !!**

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿ ان الله يبسط يده بالليل ليتوب مسيء النهار . و يبسط يده بالنهار ليتوب مسيء الليل حتى تطلع الشمس من مغربها ﴾ .موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

واته: خوای گەروە بەشەو دەستەکانی دەکاتەوە تا ئەوانەی لەڕۆژدا گوناهباربون بگەڕێنەوە لای، وەدەستەکانی لەڕۆژدا دەکاتەوە تا ئەوانەی بەشەو گوناهیان کردوە بگەڕێنەوەلای هەتا ئەو کاتەی خۆر لەخۆئاواوە هەڵدێت.

وا هەست ناکەی ڕەحمەتی خوا دایپۆشیویت ؟

ئەم چەند ساتەمان لە ژینگەیەکی پڕ ڕەحمەتی خوای بەخشندەی میهرەبان دا بەسەر برد ، ئەو خوایەی گەر بە عەدل و دادپەروەری خۆی لە گەڵماندا مامەڵە بکات ئەوا هیچ کەسێك لەسەر زەوی دا نامێنێتەوە .

ئێستا ... پاش ئەم هەستە باشە پەیمان بدە کە هەرگیز لەخوا یاخی نەبیت .. چونکە تۆ شەرمی لیّ دەکەیت ... وانیە ؟!!.

## سەیری نیعمەتەکانی خوا بکە و شەرمی لیّ بکە..

خەڵکان هەریەکەو جۆرە خەمێکی هەیە ... لەگەڵ ئەو هەموو سۆز و ڕەحمەتەی خوا کە دایپۆشیوین بەڵام کەسی وا هەیە کە حەیای نیيە بەرامبەر بە خوا ... ئەگەرناتەویّ بەشەرم و حەیا بیت بەرامبەر ئەو هەموو ڕەحمەتەی کە خوا بەسەرماندا ڕشتویەتی ... ئەی شەرم ناکەی بەرامبەر ئەو هەموو نیعمەتەی کە خوا ڕشتویەتی بەسەرتدا ؟

کیّ چاوی بۆ دروست کردوویت ؟ دەڵێیت : خوا ، ئەمەش دەڵێیت و سەیری شتی حەرامیشی پیّ دەکەیت .. شەرم ناکەیت ؟.

کیّ دڵی بۆ دروست کردوویت ؟ دەڵێیت خوا ، لەگەڵ ئەوەشدا خوا لەخۆت توڕە دەکەیت بە خۆشویستنی حەرام .. شەرم ناکەیت ؟.

## ڕەوشتی باوەڕدار

کێ ژیری پێ بەخشیوی ؟ دەڵێیت: خوا ، لەگەڵ ئەوەشدا بڕیار دەدەی کە گوێڕایەڵی نەبیت ... شەرم ناکەیت؟.

سەیری نیعمەتەکانی خوا بکە بەسەرتەوە..

خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴾ الانفطار: ٦ - ٨

واتە: ئەی ئینسان !! تۆ چی وای لێکردویت کە سەرکەش بیت بەرامبەر پەروەردگاری میهرەبان و بەڕێزت ؟ چی وایلێکردویت کە وەکو پێویست قەدری نەزانیت ؟ بەمەرجێك ئەو پەروەردگارە تۆی دروست کردوە ، بەڕێکوپێکترین شێوە ، بەجوانترین شێواز .. لەهەر شێوە و شێوازێکدا کە ویستویەتی تۆی ڕێکخستوە و ئەندامەکانتی بەیەکەوە لکاندوە.

﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ﴿٢٨﴾ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا ﴾ عبس: ٢٤ - ٣١

واتە: دەبا ئادەمیزاد سەیری خواردنەکەی بکات و سەرنجی بدات و بیری لێ بکاتەوە .. بێگومان ئێمە ئاومان بۆ داباراندوّتە خوارەوە ، چۆن داباریینێك .. لەوەودوا زەویمان بۆ لەتلەت کردوە بە چەکەرەی ناسکی ڕووەك .. ئینجا دانەوێڵەمان تێدا ڕواند .. هەروەها ترێ و سەوزە .. هەروەها زەیتون و دارخورماش .. باخچەی دەورەدراو بەدارخورما یان درەختی تر یاخود باخی چڕوپڕ .. جۆرەها میوە ، هاوڕێ لەگەڵ هەموو ئەو گژوگیایانەی کە خواکردە ومالآت دەیخوات لە لەوەڕگەکاندا .

بەڕاستی ئەمانە نیعمەتانێکن کە سوپاسگوزاریان لەسەر ناکرێ ، یەکەم سوپاسگوزاریش ئەوەیە کە شەرم بکەین لە خاوەنی ئەم نیعمەتانە ..

## ڕاهێنانێکی کرداری:

پێم باشه قسەکانمان کرداری بێت بۆیە داوات لێ دەکەم کە :

وەرەقەو قەڵەمێك بهێنەو وەرەقەکە بە قەڵەم بکە بە دوو بەشەوە ... لە بەشی یەکەمدا ئەو نیعمەتانەی خوا کە بەسەرتەوەیە بیاننوسە:

﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآ ﴾ابراهيم: ٣٤

**واتە: خۆ ئەگەر نازونیعمەت و بەخششەکانی خوا ژمارە بکەن ناتوانن بیانژمێرن .**

ئەگەر تۆ بتەوێ نیعمەتەکانی خوا بنوسی ئەوا بە چەندین کتێب تەواو نابێ ، بەڵام بە ئەندازەی ئەو بەشە چەند نیعمەتێك بنوسە وەك:

(بیستن ، بینین ، هەست ، هێز ، سۆز ، بیر کردنەوە ، پارە ، تەندروستی ، ئیسلام ...هتد).

لەبەشی دەوهەمیشدا گوناهەکان بنوسە ، مەترسە چونکە ئەم ڕاهێنانە ، نهێنیيە و تەنها خۆت پێی دەزانیت ، تەنها لە ژورەکەتدا ، پاش ئەوەی گوناهەکانت نوسی ... ئێستە سەیری لاپەڕەکە بکە ..

سوێند بەخوا کەمترین شت ئەوەیە کە بگری بەرامبەر ئەم هەموو تاوانەی کە لەبەرامبەر ئەم هەموو نیعمەتانە دا کردووتە .

ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە شەرم و حەیات هەبێ بەرامبەر بە خوا ؟

ئێستا ... تۆ لە بەردەستی خوای گەورە دای ..

خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ ﴾ طه: ٤٦

**واتە: خوای گەورە فەرموی : مەترسن من بەراستی لەگەڵتاندام ، دەبیستم و دەبینم .**

## ڕەوشتی باوەڕدار

**هەروەها دەفەرموێ:**

﴿ أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى ﴾ العلق: ١٤

**واتە: ئایا نەیزانیوە کە خوا دەیبینێت و ئاگای لە گوفتار و کرداریەتی .**

بۆ ئەوانەی تا ئێستاش شەرمیان نییە ، وە هەستیان نەکردووە ، کە خوای گەورە دەبیستێ و دەبینێ ...

بۆ ئەوانەی بیریان چووە یان لە بیر خۆیان بردۆتەوە کە لەبەردەستی خوای گەورەدا دەوەستێنرێن ئێستە بیهێنە پێش چاوت .. تۆ لەبەر دەستی خوای گەورەدا وەستاویت بەڕوتی نامەی کردەوەکانت وەردەگریت ...

لەگەڵ ئەم هێنانە پێش چاوەدا بژی بە هەموو هەست و گیانتەوە چونکە سوێند بەخوا ئەم ڕۆژە زۆر نزیکە ڕۆژێکی زۆر ترسناکە ...

**علی کوڕی ئەبی تالب دەفەرموێ:**

**( سوێند بە خوا گەلانێك دەزانم کە لەکاتی خوێندنەوەی تاوانەکانیاندا لە شەرمەزاریدا گۆشتی دەموچاویان دێتە خوارەوە ).**

ئێستە بانگت لێ دەکرێت فلانی کوڕی فلانی کوڕی فلان ... دەی خۆت دەرخە لە بەرامبەر خوای جەبار .. لەم ڕۆژەدا لەبەر شەرم و حەیا و ترس و لەرز لە خوای گەورە ناتوانی لە شوێنی خۆت بجوڵێیت ، بەڵام فریشتەکان لەناو ملیاران خەڵکدا دەتدۆزنەوەو ، دەتبەن و لە بەردەمی خوایگەورەدا دەتوەستێنن ، ئەوەی لە دوای ئەمەوە دێت لە پێغەمبەروە (ﷺ)هاتووە ... لە یادت بێت تۆ ئێستە لە بەردەمی خوای گەورە دا وەستاویت و پێت دەڵێت:

**( بەندەکم چی وای لێ کردی سەرکەش بی بەرامبەرم...**

بەندەکەم ئەتزانی کە لێرە ڕادەوەستێنرێی یان ئەم ڕۆژەت لەیادچوو ... بەندەکەم ئایا شەرمت لێ نەدەکردم ...

بەندەکەم ئایا من نزیك نەبووم لە چاوەکانتەوە کە تۆ سەیری حەرامت پێ دەکردن ...

بەندەکەم ئایا من نزیك نەبووم لە قاچەکانتەوە کاتێك تۆ پێیان دەچوویت بۆ حەرام ...

بەندەکەم ئایا لە دەستەکانتەوە نزیك نەبووم کاتێك تۆ شتی حەرامت پێ وەردەگرت ...

بەندەکەم بە سوك ئەم ڕۆژەت سەیر دەکرد ...

بەندەکەم ئایا بۆ خەڵکی خۆت جوان دەکرد و ناشیرینەکانت دەنارد بۆ من ...

بەندەکەم ئەم کردی بە هاوسەردار،نیعەمتی خۆمم بەسەردا نەڕشتی ...

بەندەکەم ڕۆزیم نەدا پێت ).

چ حاڵێکت هەیە ئەی هەژار لە کاتێکدا تۆ لەم حاڵەدا وەستاوی ؟!

پاشان خوای ( ملك ) دەفەرموێ:

( بەندەکەم نامەی کردەوەکانت بخوێنەرەوە )

دەست دەکات بە خوێندنەوە ... بە خراپەیەکدا دەڕوات ڕوی ڕەش دادەگیرسێ ، بە چاکەیەکدا دەڕوات ڕوی سپی و گەش دەبێت ...

دەگونجێ لە دنیا دا کەسانێك ژیابن کە هیچ پلەیەك لە پلە کانی حەیایان نەبوبێ ، بۆیە لە ڕۆژی دوایش دا حەیایان پێوە نابینی دەڵێت : خوایە من شایەتی شایەتدارانم قبوڵ نیە ! شایەتی فریشتەکانم قبوڵ نیە ... وە شایەتی ئەم نامەیەم قبوڵ نیە کە نوسراوە..

## ڕەوشتی باوەڕدار

**خوای گەورە دەفەرموێ:**

**ئەی چیت دەوێ ؟**

**دەڵێت : هیچ شایەتێك قبوڵ ناكەم تەنها لەنەفسی خۆم نەبێ ،**

**خوایگەورە دەفەرموێ :**

**بەڵی ، ئیتر مۆر دەنێ بە دەمییەوە:**

﴿ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ يس: ٦٥

**واتە: ئەمڕۆ مۆر دەنێین بەدەمیاندا و قسەیان بۆ ناكرێت ، بەڵكو دەستیان قسەمان بۆ دەكات قاچیشیان شایەتی دەدات بەو كاروكردەوانە كە ئەنجامیان دەدا .**

﴿ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ فصلت: ٢٢

**واتە: ئێوە كاتی خۆی ئەوەندە غەڕڕا بوون ، گوناه و تاوانەكانتان نەدەشاردەوە ، چونكە مەترسیتان نەبوو كە گوێتان و چاوتان و پێستتان شایەتیتان لەسەر بدات ، بەلام گومانتان وابوو كە بەڕاستی خوا زۆر ئاگادار نیە بەو كاروكردەوانەی كە ئەنجامی دەدەن.**

**ئێوە شەرم لەخوا ناكەن....؟**

**خوای گەورە فەرمووی بەم كابرایە كە زۆر لێی توڕەیە:**

« اذهب يا عبد السوء عليك لعنتي فلا اتقبل منك ابدا » .

**واتە: بڕۆ ئەی بەندەی خراپە ، نەفرینی منت لێ بێ و هەرگیز لێت وەرناگرم!!.**

**لا حول و لا قوه الا بالله ...**

**شەرم كە لەخوا پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت ببیتە ئەم پیاوە ... وەیل بۆ تۆ گەر لە شوێنی ئەو بیت .**

بەڵام سەیری ئەوە بکەن کە لە دونیادا شەرمی لەخوا کردووە حاڵی چۆنە ؟

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:

﴿ یدنی الله تبارك و تعالى العبد المؤمن منه یقول له : اون عبد اتذکر ذنب کذا ؟ اتذکر ذنب کذا ؟ اتذکر ذنب کذا ؟ حتى یظن العبد انه هلك ، فیقول الله : سترتها علیك في الدنیا و ها انا اغفرها لك الیوم ﴾.

بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

واتە: خوای گەورەو مەزن بەندەی باوەڕدار لەخۆی نزیك دەکاتەوەو پێی دەفەرموێت : نزیك بەرەوە ئەی بەندەکەم یادی فلانە گوناهەت هەیە؟ لەیادتە ئەو گوناهەیەت کرد ! تا بەندەکە گومانی ئەوە دەبات کەتیاچوەو ڕزگاربونی مەحاڵە!! خوای گەورە دەفەرموێت: لەدونیادا بۆم داپۆشیت وە ئەوەتا ئێستاش لێت خۆش دەبم..

ئایا لە دوای ئەم حاڵە قورسە شتێکی تر هەیە بوترێ ؟

ئایا پاش هەموو ئەمانە شەرم لەخوا ناکەیت و بەردەوام دەبی لەسەر تاوان ؟

ئایا تاکو ئێستەش سوری لەسەر ئەوەی کە دوور بی لەخواپەرستی ؟

ئایا تاکو ئێستەش سووری لەسەر ئەوەی کە بەرگی حەیا و باڵاپۆشی نەپۆشی ؟

توخوا شەرمکەن لەخوا.... بەسە ئیتر .

# جۆرەکانی حەیا

زانایان دەفەرموون :
حەیا لەخوا شەش جۆری هەیە : منیش بانگت دەکەم ئەچرپێنم بە گوێتدا ... پێش ئەوەی جۆرەکانی حەیا بزانیت بە خێرایی بەوەدا بچۆرەوە کە خوێندتەوە هەتا بەباشی سود وەرگری و مەبەستەکە جێ بەجێ ببێت ...
دەی چاوەڕوانی چیت ؟!.

## جۆری یەکەم : حەیای تاوان..

واتە: حەیای ئەو کەسەی کە تاوانێك ئەنجام دەدات ... وەك حەیای گەورەمان ئادەم کاتێك لە دارەکەی خوارد ئیتر خۆی و هاوسەرەکەی لە بەهەشتدا دەگەڕان ، خوای گەورە پێی فەرموون:
( بۆ کوێ ئەی ئادەم ئایا ڕادەکەی لە من ؟ ئەویش فەرمووی : نەخێر خوایە گیان بەڵکو شەرم دەکەم لێت ).
ئایا ڕۆژێك لە ڕۆژان حاڵەتێکی وات بەسەر هاتووە کە شەرم بکەی لە خوا و خەوت لێ نەکەوتبێ لەبەر ئەوەی گوناهێکت ئەنجام داوە؟.
یان بە خێرایی لەماڵ چوبیتە دەرەوە بۆ ئەوەی پێنج دینار یان دە دینار یان ...... ببەخشی وەك حەیایەك بەرامبەر بە خوای گەورە ؟.

## جۆری دووەم : حەیای کەمتەرخەمی..

واتە: حەیای ئەوانەی کە بەحەقی خۆی و بە تەواوی خواپەرستیەیان ئەنجام نەداوە ... جا کێ هەیە بەوپەڕی تەواوی خوا بپەرستێ ؟

کەسێك نابینیت کەواتە هەمووومان کەمترخەمین..

وەك حەیای فریشتەکان ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:

﴿أطت السماء - أي أزومت و ثقلت — و حق لها أن تئط . و ما فيها موضع ثلاثة أصابيع إلا و ملك ساجد . أو ملك راكع . أو ملك قائم لله . حتى إذا قامت القيامة يقولون : سبحانك ما عبدناك حق عبادتك ﴾.

ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

واتە: نرکەی دێت ئاسمانەکان ( واتە ئەوەندە قـەرەباڵغو قـورس بـوە ) حـەقی خۆشیەتی کە نرکە نرکی بێت ، جێگەی سێ پەنجە نەماوە تیایـدا فریـشتەیەکی تیانەبێت یا لەکرنوشدایە ،یا گەردن کەچە، یا بۆخوا هەستاوە، تاقیامەت دێت بەو شێوەیەن، کاتێ قیامەتیش دێت دەڵێن: پاکو بێگەردی بۆتۆ ئـەی خـوای گـەورە بەشیاوی خۆت ئێمە پەرستشی تۆمان نەکرد !!!

ئایا هەستت بەم کەمترخەمیە کردووە پێشتر ؟

بەڵێ.. ئەی شەرمت کردووە لە خوا ؟

ئەم وشانە کەس تامەکەی نازانێ مەگەر کەسێك چەشتبێتی..

چەند عیبادەتت زیاتر بێت شەرم و حەیات زیاتر دەبێ لە بەرامبەر خوای گەورە ، چەند ئیمانت بەرزتر بێت هێندە حەیات زۆر تر دەبێت لە بەرامبەر خوای گەورە دا .

بەڕاستی حەیای کەمترخەمی کۆتایی ذییە.

## جۆری سێهەم: حەیای هەست کردن

## بە نیعمەتەکانی خوا بەسەرتەوە..

ئەم جۆرەیان لەوێوە سەرچاوە دەگرێ کە هەست بکەی لە نیعمەتەکانی خوادا نغرۆ بویت ، ئیتر نازانی چۆن سوپاسی بکەی لەبەر ئەوەی شەرمی لێ دەکەیت .

وەك:حەیای پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك دەپاڕێتەوە و دەفەرموێ:

﴿ لا احصي ثناء عليك أنت كما أثنيت على نفسك ﴾ .

ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: ستایشەکانی تۆ لەژمارە نایەت وێنەی ئەوەی خۆت ستایشی خۆتت کردوە .**

## جۆری چوارەم : حەیای بەندایەتی..

ئەوەش حەیای بەندەیەکی گوێڕایەڵی ڕاستگۆیە ، وەك حەیای پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك قیبلەی مسوڵمانان ڕووی لە( بيت المقدس ) بوو ،بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) دەیویست ڕووی لە کەعبە بێت ، ئایا فەرموی خوایە ڕووی قیبلە بگۆڕە ؟ ناسوێند بەخوا ... ئەوە حەیای بەندەیە.. خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾البقرة: ١٤٤

**واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسوڕانی ڕوخسارت ڕوبەئاسمان دەبینین .**

پێغەمبەر(ﷺ)چاوەکانی سەیری ئاسمانی دەکرد و لەبەر حەیای بەرامبەر خوا قسەی نەدەکرد ...

کێ لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەندەو خوا پەرستتر بووە لەسەر زەویدا کە لە پێشتر بێت لەحەیای بەندایەتیدا ؟.

## جۆری پێنجەم : حەیای خۆشەویستی..

ئەم جۆرەیان پێویست ناکات بیخوێنیتەوە بەڵکو پێویستە لەگەڵیدا بژیت و چێژی لێ وەرگریت . کەواتە دڵتم بۆ بکەرەوە:

لە خۆشەویستی زۆرت بۆ خوا شەرمی لێ دەکەیت ، لەوانەیە بگریت و چاوەکانت فرمێسک بڕێژن یا خود دڵت بپەشۆکێ ... یاخود جەستەت گرژ ببێت ...

هەر لە خۆشەویستی وحەیای زۆری پێغەمبەرەوەیە بۆ خوا کە دەفەرموێ:

﴿اللهم ارزقني حبك وحب من احبك . وحب عمل يقربني الى حبك ﴾.

ترمزی ریوایەتی کردوە.

**واتە: خوایەکیان خۆشەویستی خۆتم پێ ببەخشە، وەخۆشەویستی ئەوانەی تۆیان خۆشدەوێت، وەخۆشەویستی هەرکردەوەیەك نزیکم دەخاتەوە لەخۆشەویستی خۆت.**

ئەم جۆرە جارێکی تر بخوێنەرەوە .. تاقیبکەرەوە بەندایەتیەکانت زیاد بکە ... ئەو کات لەدڵتدا خۆشەویستی خوا چەکەرە دەکات و دواتر شەرمی لێ دەکەیت ... ئەمەش هەستێکە ناتوانیت وەسفی بکەێت.

## جۆری شەشەم: حەیای گەورەیی خوا..

ئەم جۆرە سەرچاوە دەگرێ لە گەورەیی و بەدەسەڵاتی خواوە .

وەك:حەیای جبریل (سەلامی خوای لێ بێت) لەگەشتی ئیسرا و میعراجدا ، کاتێك لە ئاسمانی حەوتەم بوون ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ چووە( سررة المنتهى) و جبریلیشی لەگەڵدا بوو ، لەپڕ جبریل وەستا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:

﴿ فالتفتت الى جبريل . فاذا هو كالحلس البالي . (قطعت القماش الممزقة) ﴾

واتە: لامکردەوە بەلای جبریلدا دیتم وێنەی بەرماڵێکی شیتەڵ بوی لێهاتبو ( وەك پارچە قوماشێکی پەرت بو)

لە ترسی خوا و لە حەیای بەرامبەر بە خوای گەورە .

پاکو بێگەردی بۆ خوا ...

﴿ وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ ﴾ الانعام: ٩١

واتە: وەکو پێویست قەدری خوایان نەگرت .

حەیا وات لێ دەکات کە لەکاتی تاواندا هەزار جار بیر بکەیتەوە ... تۆ گوناه بەرامبەر بەکێ دەکەی ؟!.

## لە کۆتاییدا..

﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ یونس: ٦٢

واتە: ئاگاداربن بەڕاستی چاکان و خۆشەویستانی خوای میهرەبان نەترس و بیم رویان تێ دەکات، نە غەم و پەژارە و دڵتەنگی دایان دەگرێت.

ئیستا :

بە هۆی حەیاوە هەستت کرد کە تۆ گوناهباری ؟!

بەهۆی حەیاوە هەستت کرد کە کەمترخەمی لە خواپەرەستیدا ؟!

بەهۆی حەیاوە هەستت کرد کە تۆ بەندەیەکی لاواز و هەژاری ؟!

بەهۆی حەیاوە هەستت کرد کە تۆ خوات خۆشدەوێ ؟!
بەهۆی حەیاوە هەستت کرد کە خوا زۆر گەورەو بەدەسەلاتە ؟!
بەهۆی حەیاوە هەستت کرد کە تۆ بەنیعمەتی خوا داپۆشراوی ؟!
مژدە بێت..
زانایان دەفەرمون :

( من استحی من الله بلغ مقامَ الأولیاء ) .

ئەوەی شەرم لە خوا بکات گەیشتۆتە پلەی چاکان و خۆشەویستانی خوا.





## ڕەحـــــــمەت

### پیشەکیەك لەوپەڕی گرنگیدا..

ڕەوشتێکە هەمومان دەیزانین ، وە دەزانین چ واتایەکی هەیە ، بەڵام وای لێ هاتوە ئێستا نایبینین لە ناوماندا ، مرۆڤایەتی دوور کەوتۆتەوە لێی، جیهان بە گشتی زۆر پێویستیان بەم ڕەوشتە هەیە ، بەهۆی نەمانی ئەم ڕەوشتەوە تاوان بڵاوبۆتەوە و موشەکی ئەتۆمی دروست دەکرێت کە لە چرکەیەکدا ملیۆنەها کەس دەکوژێت.

ئەوە ڕەوشتی ڕەحمەتە کە بوونی لەناو مرۆڤایەتیدا زۆر دەگمەنە ..ئێستا لەمەدا لەگەڵمدایت ..؟!.

### ناتەوێ ڕەحمت پێ بکرێ لە دوارۆژدا ؟

داوا نەکراوە تەنها زانستمان هەبێت بەرامبەر بەو ڕەوشتە و بەس ، بەڵکو ئەوەی پێویستە جێبەجێ کردنیەتی لە ژیانی ڕۆژانەدا ، گەر وەکو ئەوەی کە پێویستە جێبەجێی بکەین ئەوا زەمانەتی ڕەحمەتی دوا ڕۆژمان بۆ دەکات بە ویستی خوا .

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:

﴿ إنما يرحم الله من عباده الرحماء ﴾. بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: خوای گەورە ڕەحم بەوانە دەکات بەڕەحم وسۆزن لەبەندەکانی.**

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانمان پێ دەکات کە بگرین لەکاتی قورئان خوێندندا،خۆ ئەگەر نەمانتوانی ئەوا دەبێ خۆمان بگرێنین !!

- ڕەحمەتیش هەر وایە :

داوا کراوە کە بیخەینە بواری کردارەوە ... چونکە خاوەن ڕەحمەکان خوا ڕەحمیان پێ دەکات ... ڕەحم بەوانەی سەر زەوی بکەن ئەوەی کە لە ئاسمانە ڕەحمتان پێ دەکات ، ئایا ناتەوێ ڕەحمت پێ بکرێ لە دوا ڕۆژدا ....!؟.

## ڕەوشتی ڕزگار بوون..

ئامانجی سەرەکی لەباسی ئەم ڕەوشتەدا ئەوەیە کە بەهاکەی بزانین ... بزانین کە ئەم ڕەوشتە ڕەوشتی ڕزگاربوونە لە ڕۆژی دوایی‌دا ... وەبێ گومان زۆر پێویستیشە بزانیت کە تۆ ڕەحمت پێ دەکرێ لە قیامەتدا یان نا !.

وە ئەم پرسیارەش لە خۆت بپرسە :

ئایا تۆ ڕەحم بە خەڵکی دەکەیت ؟

پەیوەندی‌یەکی پتەو هەیە لە نێوان مامەڵەت لەگەڵ خەڵکیداو ڕەحمەتی ڕۆژی دوایی ... هەر کەس لەم دونیایەدا بە ڕەحمەت مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بکات ، چاوەڕوانی چی دەکات لە دواڕۆژدا ؟

ئێستا دەبێ کێ شایستەی ڕەحمەتی خوایی بێت لە قیامەتدا ؟!.

## ڕەوشتی باوەڕدار

### لەسەر بەڵگەو بەرچاوڕوونی..

ئێمە چەند وێنەیەکی ڕەحمەت دەخەینە ڕوو ئەوەی کە داواکراوە جێبەجێ بکرێ ، وە بۆ ئەوەی لەسەر بەڵگە و بەرچاوڕونی بێت ... ویستم باسەکە بەم جۆرە بڕوات :

چۆن لەگەڵ گەورەکان بەڕەحم بین...؟ چۆن لەگەڵ دایك و باوك بە ڕەحم بین...؟ ئافرەتان .... منالآن ... خزمەتگوزار ... گیانداران ...

بەڵام سەیرم کرد ئەگەر من بەم وێنە کرداریيانە دەست پێ بکەم زۆر بە وریایيەوە لەگەڵمدا نابیت ... ووتم : چ ڕێگەیەکی جوان هەیە پێی بچمە ناو باسەکەوە ؟ دەرەنجام وام بەباشزانی کە باشترین ڕێگەیەك بریتيیە لەباسی ڕەحمەتی خوا بەرامبەرمان ... وە دەمەوێ پێش خوێندنەوە وا هەست بکەی کە فریشتەکانی خوا دەورەیان داویت ، ڕەحمەتی خوا دایپۆشیویت ، ئارامی دادەبارێ بەسەرتدا ..

دەی پێشوازی لە ڕەحمەتەکانی خوا بکە .

**كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ ..**

سەیری ڕەحمەتی خوا بکە بەرامبەرمان ، دەفەرموێ:

﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾ الأنعام: ٥٤

واتە: پەروەردگارتان فەرزی کردوە لەسەر خۆی کە بەرەحم و میهرەبان و دلۆڤان بێت .

بیر لەم ئایەتە بکەرەوە !! وە سەیری ئەم وشەیەبکە ﴿ كَتَبَ ﴾ .

پاکو بێ گەردی بۆ خوا ! ئەم ئایەتە دوو جار لە سورەتی ( الأنعام ) دا هاتووە .

ئایا هەست بە ئارامییەك ناكەیت دوای ئەم ئایەتە ...؟ مەترسە چونكە ﴿ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ﴾ .

ئەسڵ لە سیفاتی خوادا ڕەحمەتە بەڵام توڕەبون دەرەنجامی كردارەكانتە نەك سیفەتێكی پەیوەست ، چونكە سیفەتی پەیوەست و بەردەوامی خوای گەورە ڕەحمەتە .

## ورحمتي و سعت كل شيء..

خوای گەورە ڕووبەڕوی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ :

﴿ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَاسِعَةٍ ﴾ الأنعام: ١٤٧

واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ جا ئەگەر باوەڕیان پێ نەكردی ئەوە بڵێ : كە پەروەدگارتان خاوەنی رەحمەت و میهرەبانی فراوان و بێ سنورە .

تۆ كاتێك ئەم ئایەتە دەخوێنیتەوە پرسیارێك دێت بە بیرتدا ... ئەویش ئەوەیە :

ئایا ئەم ڕەحمەتە فراوانە دەبێ چەند بێت ؟

ئەم ئایەتە وەڵامت دەداتەوە:

﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴾الأعراف: ١٥٦

واتە: رەحمەت و میهرەبانیم هەموو شتێكی گرتۆتەوە .

بیر لەمە بكەرەوە ﴿ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ وە فراوانیەكەی بهێنە پێش چاوت ...

دەتبینم بیرت لە هەموو شتێك كردەوە ... دە سوپاسی خوا بكە لەسەر ڕەحمەتی فراوانی كە هەموو شتێكی گرتۆتەوە.

## أن رحمتي سبقت غضبي..

## ڕەوشتی باوەڕدار

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەموێ:**

(لما خلق الله الخلق كتب في كتابه فهو عنده فوق العرش ان رحمتي تغلب غضبي).بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: کاتێك خوای گەورە دروستکراوەکانی بەدیهێنا لەوکتێبەدا لای خۆیەتی لەسەر عەرشدا نوسی: ڕەحمەتی من پێش توڕەبونم کەوتوە.**

**لە گێڕانەوەیەکی تردا** (ان رحمتي سبقت غضبي) سیوتی ڕیوایەتی کردوە.

**پاکو بێ گەردی بۆ خوا ! بیهێنە پێش چاوی خۆت کە بونەوەر لەسەر بناغەی ڕەحمەت وەستاوە .**

## الا ان يتغمدني الله برحمته..

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

(ما من احد يدخله عمله الجنة ، فقيل ، ولا انت يارسول الله ؟ قال : ولا انا إلا ان يتغمدني ربي برحمته) . موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هیچ کەسێك نیە کردەوەکانی بیخاتە بەهەشتەوە!! وترا تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرموی تەنانەت منیش مەگەر خوای گەروە زۆر لێشاوی ڕەحمەتی خۆیم بخات!!**

**گوێم لێتە دەڵێی خوایە بمانپۆشە بەڕەحمەت ئەی بە ڕەحمترین بە ڕەحمەکان..**

**یاالله ... بونەوەر لەسەر ڕەحمەت وەستاوە ... ئادەم دروست کراو ڕەحمەتی لەگەڵدا بوو .. کەسیش ناچێتە بەهەشتەوە تەنها بە ڕەحمەتی خوا نەبێت ... سەیری بەهای ڕەحمەت بکەن ...**

**هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:**

﴿ ان الله خلق الرحمة يوم خلقها مائة جزء ، امسك عنده تسعة و تسعين . وانزل في الأرض رحمة واحدة يتراحم بها الخلائق . حتى الدابة ترفع حافرها عن وليدها خشية أن تصيبه ﴾ . بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: خوای گەورە ئەوڕۆژەی ڕەحمەتی بەدیهێنا کردیە سەد بەش، لای خۆی نەوەدو نۆی هێشتەوە، تەنها یەك ڕەحمی هێنایە سەرزەوی کەدروستکراوەکانی لەناو خۆیاندا بەیەکتری دەکەن،تەنانەت ئاژەڵ سمی بەرزدەکاتەوە کاتێك بەر بێچوەکەی دەکەوێت نەوەکو ئازاری بدات!.**

**تەنها یەك ڕەحمەت لەدنیادا !! هەموو ئەمانە ، تەنها یەك ڕەحمەتە !! هەموو دروستکراوەکان ... مرۆڤ .. گیاندارن ... باڵندە ... زیندەوەران ... هەموو ئەمانە بە تەنها یەك ڕەحمەت ڕەحم بە یەکتری دەکەن !!**

**وە نەوەدونۆ بەشی بۆ هەڵگرتووین بۆ قیامەت . لەگەڵمدا هەست بەو ئارامیەیە دەکەی کە ئێستە دایپۆشیوین ؟!.**

## ڕەحمەتانێك کە دەبێ لە یادمان بن..

**خوای گەورە دەفەرموێ :**

﴿ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُواْ فِيهِ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ القصص: ٧٣

**واتە: لەرحمەت و میهرەبانی ئەو زاتە ئەوەیە کە : شەو و ڕۆژی کردوە بەهۆی ئارامی و حەوانەوە و کارو کاسپی کردن و بەهرەبردن لە بەخششەکانی ، بۆ ئەوەی تا دەتوانن شوکرانەبژێر و سوپاسگوزاری بکەن.**

**کەواتە لە ڕەحمەتی خوایە بەرامبەرمان کە شەو و ڕۆژی بەدی هێناوە .**

## ڕەوشتی باوەڕدار

لەگەڵمدا بیهێنە پێش چاوت ... ئەگەر دنیا تەنها شەو بوایە یان تەنها ڕۆژ بوایە دەتزانی ئەو وەختە ژمارەی ئەو نەخۆشیە دەروونیانە چەندن کە توشمان دەبوون ؟.

خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴾ القصص: ٧١

**واتە: ئەی محمد(ﷺ) بڵێ : خەڵکینە هەواڵم بدەنێ ئەگەر خوا شەوگار بکات بەهەمیشەیی تا ڕۆژی قیامەت چ خوایەکی تر هەیە جگە لە(اللّٰه) بتوانێت روناکیتان بۆ فەراهەم بێنێت ئایا ئێوە ئەم راستیانە نابیستن؟.**

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾ القصص: ٧٢ **واتە: هەروەها پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر خوا ڕۆژگاری کردە هەمیشەیی لەسەرتان تا ڕۆژی قیامەت خایاندی ، کام خوا هەیە جگە لە (اللّٰه) کە شەوگارتان بۆ پێش بهێنێت تا ئارامی تێدا بگرن ، ئایا ئێوە سەرنجی ئەم دیاردانە نادەن و نایانبینن؟!.**

هەروەها سەیری ڕەحمەتی خوای گەورە بکە لە دروستکردنی شەو وڕۆژ دا ڕۆژ لەپڕدا نابێتەوە وە هەروەها شەویش لەپڕ دانایەت ، بەڵکو بە پلەبەندی دەگۆڕێن ، خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴾ التكوير: ١٧ - ١٨

**واتە: بەو شەوەی کە دادێت و تاریکیەکەی روومان تێ دەکات .. بەبەرەبەیان کەپشوی تێ دێت ، وەکو زیندەوەرێك ئاهی تێ دێتەوە و دەستدەکات بە هەناسەدان و ژیان روناکیەکەی دەردەکەوێت.**

ئەوە ڕەحمەتانێكن ... هەستیان پێ ناكەین و سەرنجیان نادەین ئەگەر چی ڕۆژانە دەیان بینین . چ ڕەحمتێكن ئەمانە كە پێویستە ئێمە لە یادیان نەكەین .

## فانظر إلی آثار رحمت الله

**خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِی یُنَزِّلُ ٱلۡغَیۡثَ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُوا۟ وَیَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥ ﴾الشوری: ٢٨

**واتە:خوا ئەو زاتەیە كە باران دەبارێنێت و دەیگەیێنێتە فریایان دوای ئەوەی كە نائومێد بوون ، هەروەها ڕەحمەت و بەخششی خۆی پەخش دەكاتەوە.**

**بەبێ ئاو زەوی دەمرێ ، وەرن با بەیەكەوە سەرنج لە﴿ وَیَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥ ﴾ بدەین وەك بڵێین باران ڕەحمەتی خوا دابەش دەكات بەسەر زەویدا ، با هەڵیدەگرێت و دابەشی دەكات .**

**ئەمەش بۆ تۆ ... خوای گەروە دەفەرموێ :**

﴿ فَٱنظُرۡ إِلَیٰۤ ءَاثَـٰرِ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ كَیۡفَ یُحۡیِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۤ ﴾الروم: ٥٠

**واتە: جا ئیتر سەرنج بدە و تەماشای چەندەها ئاسەواری ڕەحمەتی خوا بكە ، كە چۆن زەوی زیندوو دەكاتەوە دوای مردنی .**

**یاالله .. بیهێنە پێش چاوت گەر ڕەحمەت لەدەست بدەیت ... ڕەحمەتی خوا لە داباریینی باراندا خوای گەروە دەفەرموێ:**

﴿ ءَأَنتُمۡ أَنزَلۡتُمُوهُ مِنَ ٱلۡمُزۡنِ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنزِلُونَ ۝٦٩ لَوۡ نَشَاۤءُ جَعَلۡنَـٰهُ أُجَاجࣰا فَلَوۡلَا تَشۡكُرُونَ ﴾ الواقعة: ٦٩ - ٧٠ **واتە: ئایا ئێوە داتانبەزاندوە لە هەورەكانەوە یان ئێمە دایدەبەزێنین ؟ ئەگەر بمانویستایە ئەو ئاوەمان دەكردە خوێیەكی تاڵ و سوێر جا ئایا بۆ سوپاسگوزاری ناكەن .**

## ڕەوشتی باوەڕدار

بیهێنە پێش چاوت گەر بارانەکە سوێر بوایە زەوی دەمرد . لەخۆت بپرسە چەند ڕۆژ دەژیایت بە بیٚ ئاو ... ؟!

ئەوە ڕەحمەتی خوایە بەرامبەرمان .

## ڕەحمەتێك خوا لەدڵەکاندا جێگیری کردووە..

لە ڕەحمەتەکانی خوا ڕەحمەتی پەیوەندی کۆمەڵایەتیە.. ڕەحمەتێکە لە دڵەکاندا جێگیر بووە . خوای گەورە خۆشەویستی منداڵی لەدڵی باوك و دایك دا جێگیر کردووە .

هەموو دایك و باوکێك ، مرۆڤ بیٚ یاخود گیاندار ، لە ناوەوەیدا ڕەحمەتێك هەیە خوا جێگیری کردووە بەرامبەر لە دایکبووەکانی .

سوێند بەخوا بەبیٚ ئەم ڕەحمەتە زەوی دەشێوێت . هەروەها ڕەحمەتێك کە خوای گەورە لە دڵی خێزانەکاندا جێگیری کردووە ، مام و خاڵ ، ئامۆژن و خاڵۆژن .... یان سەیری ئەم ڕەحمەتە بکە ... خوای گەورە لە دڵی دواندا جێگیری دەکات ، دەربارەیان دەفەرمویٚ:

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الروم: ٢١

**واتە: یەکێك لەنیشانەو بەڵگەکانی تری خوای گەورە ئەوەیە کە : هەر لەخۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایدا و لەنێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی فەراهەم هێناوە ، بەڕاستی ئالەودیاردانەدا نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیردەکەنەوە و تێدەفکرن.**

یاالله ....!! یەکەم شتێك کە ئەم ماڵەی پێ بینا دەکرێت خۆشویستی و ڕەحمەتە بەڵام بە تاوان و دوورکەوتنەوەیان لەخوا پلەپلە ئەو ڕەحمەتەیان لێ دادەڕنرێ.

## لە ڕەحمەتی خوایە کە بە گوناهەکانمان لەگەڵمان ناکات..

کێ لە ئێمە لە ژیانیدا بە هیچ جۆرێك گوناهی نەکردوە..؟

کێ لە ئێمە لە ژیانیدا تەنها سەد گوناهی کردووە ....!؟

کێ لە ئێمە لە ژیانیدا هەزار گوناهی کردووە ....!؟

کێ لە ئێمە لە ژیانی دا ......

لە ڕەحمەتی خوایە کە بەگوناهەکانمان نامانگرێ چونکە گوناهەکانمان زۆر زۆرن . لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە موڵەتمان پێ دەدات ... ئەم ئایەتە بخوێنەرەوە و سەیری حاڵت بکە و ساڵەکانی تەمەنت بهێنەرەوە یاد ، خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ وَرَبُّكَ ٱلْغَفُورُ ذُو ٱلرَّحْمَةِ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا۟ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلْعَذَابَ ﴾ الكهف: ٥٨

واتە: پەروەردگاری تۆ لێخۆشبوە و خاوەنی رەحمەت و میهرەبانیە ، ئەگەر بەکردەوەی ئەو خەڵکە بکات هەموویان بەخێرایی دەپێچێتەوە و بەسزای سەخت دەیانگەیێنێت .

وا دەزانم ئێستا ناتوانی هیچ بکەی تەنها ئەوە نەبێ بڵێیت :

سوپاس بۆ تۆ خوایە..

دڵنیا بە ... ئەو تاوانەی دوێنێ کردتت یان ئەوەی کە هەفتەی پێشوو ئەنجامتدا گەر دایك و باوکت پێیان بزانیایە لێت خۆش نەدەبوون ، بەڵام خوای گەورە لێخۆشبوو و میهرەبانە .

## ڕەوشتی باوەڕدار

**خوای گەورە دەفەرمویٚ:**

﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ النور: ١٤

**واتە: خۆ ئەگەر فەزلو بەزەیی خواو بەخشندەییەکەی نەبوایە لەسەرتان لەدونیاو قیامەتدا، بەهۆی ئەو تاوانەتانەوە سزایەکی زۆر گەورەو سەختتان تووش دەبوو ، بەهۆی رۆچونتان لەو دەنگوباسەدا.**

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا ﴾ النور: ٢١

**واتە: ئەگەر فەزلٚ و میهرەبانی خوانەبوایە لەسەرتان ئەوە هەرگیز کەستان پاکوپوختەو رزگار نەدەبوون .**

**هەروەها دەفەرمویٚ:**

﴿ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَـٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴾ يس: ٤٣ - ٤٤

**واتە: خۆ ئەگەر بمانەوێت نوقمیان دەکەین ، ئەوکاتە کەس نیە بێت بەهاواریانەوە و رزگاریش ناکرێن لە مردن * مەگەر رەحمەت و میهرەبانی ئێمە مۆڵەتیان بدات تاکو ماوەیەکی دیاریکراو بەهرە لەژیان وەربگرن.**

**خوای گەورە گەر بە هۆی تاوانەکانمانەوە لە ناوی ببردینایە سەر زەوی هیچی تێدا نەدەما ، بەڵام وەك ڕەحمەتێك بەرامبەرمان مۆڵەتمان دەدات تا تەوبە بکەین و لێمان خۆش بێت ، ئایا ئەم ڕەحمەتە پێویستی بە سوپاسگوزاری نیە ؟**

﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ ابراهیم: ٧

**واتە: ئەگەر سوپاسگوزار و شوکرانەبژێر بن ، رزق و رۆزی و نازونیعمەتتان بەسەردا دەڕژێنم و زیادی دەکەم .**

## له ڕەحمەتی خوا داپۆشینتانه له پاش گوناه..

بیهێنه پێش چاو گەر لەدوای تاوان خوا ئاشکرای بکردینایه ...

بۆ نمونه: پاش ئەنجامدانی گوناهێك لەسەر دەرگای ماڵەکەت ورد و درشتی گوناهەکەت بنوسرایه .... فلان کەس گوناهی کرد وای کرد و وای کرد و وای کرد ، بەڵام لەڕەحمەتی خوایه که دوای گوناه دەمانپۆشێ و ئاشکرامان ناکات .

بیهێنه پێش چاو گەر گوناه بۆنی هەبوایه ....!! هەرکات تاوانێکت ئەنجام بدایه بۆنێکت لێ دەرچووایه دڵنیا به لەبەر پیسی بۆنەکه کەس لەگەڵ کەسدا نەیدەتوانی هەڵبکات.

بەڵام له ڕەحمەتی خوایه که دەمانپۆشێ .

پیاوێك دزی کرد ، گرتیان و بردیانه خزمەت گەورەمان عومەری کوڕی خەتتاب ، پیاوەکه به حەزرەتی عومەری ووت : سوێند دەخۆم به خوا ئەمه یەکەم جارمه... عومەر فەرمووی : درۆ دەکەیت خوای گەوره له یەکەم جاردا بەندەکانی ئاشکرا ناکات ...

به ڕاستی ئەمەیه یاسای ڕەحمەت که گەورەمان عومەری کوڕی خەتتاب فێرمان دەکات .

## له ڕەحمەتی خوا ئاسانکاریه له تەوبەکردندا..

خوای گەوره دەفەرموێ :

# ڕەوشتی باوەڕدار

﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ البقرة: ٣٧

**واتە: پاشان ئادەم لەلایەن پەروەردگاریەوە چەند وشە و نزایەکی وەرگرت (بەدڵ و بەکوڵ پاڕایەوە )خوای میهرەبانیش نزاکەی وەرگرت و لێی خۆش بوو ، چونکە بەڕاستی تەنها ئەو زاتێکی ئێجگار میهرەبان و تۆبە وەرگرە .**

**گەورەمان ئادەم کاتێك کە توشی گوناهەکە بوو وە لەدارەکەی خوارد پەشیمان بووەوە بەڵام نەیدەزانی چۆن تەوبە بکات ..**

﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾

**گەر بڵێیت خوای گەورە تەوبەی لێ وەردەگرێت لێی خۆش دەبێت ... ئەی ئەو ووشانە چین ؟ ئەمانەن :**

﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ الاعراف: ٢٣ **واتە: ووتیان: پەروەردگارا ئێمە ستەممان لەخۆمان کرد، خۆ ئەگەر لێمان خۆش نەبیت و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە ، ئەوە بەڕاستی ئێمە لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانین .**

**بەڕاستی خوای گەورە تەوبەی بۆ ئاسان کردووین هەر وەك چۆن بۆ باوکە ئادەمی ئاسان کرد .**

**پاکو بێ گەردی بۆخوا ...!! سەیر لەوەدا نیيە کە بەندە زەلیلی و خۆشەویستی دەربڕێ بۆ خاوەنەکەی و گەورەکەی . سەیر لە وەدایە کە گەورە خۆشەویستی بنوێنێ بەرامبەر بەندەکەی ...**

**خوای گەورە بە ڕەحمەتی خۆشەویستیمان بۆ دەردەبڕێ ..**

**دەتبینم هەست دەکەی ئەم ئایەتە نهێنیيەکی گەورەی تێدایە .. کەواتە بیکەرە نزای هەمیشەت با لە زارت دوور نەکەوێتەوە .... وە بیکەرە سەرەتای سەردەمێکی نوێ ..**

﴿ رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ .

## لە ڕەحمەتی خوا ناردنی پێغەمبەران و دابەزاندنی کتێب و دانانی شەریعەتەکانە..

یاالله ..! ئەگەر ئەوە جێبەجێ بکەن کە لە قورئاندا دابەزیوە ڕەحمتان پێ دەکرێ..

بەڵێ ئەم قورئانە پیرۆزە و ئەم شەریعەتی ئیسلامی‌یە لە ڕەحمەتی خوایە بەرامبەرمان ، ئاممان نەکەی بلێیت بڕینی دەستی دز و جەلد و سنورەکان ، ئەمانە ستەمن ... نا سوێند بە خوا ئەوە ڕەحمەتی خوایە بەرامبەر ئەم کۆمەڵگەیە بۆ ئەوەی چاك بێتەوە .

ئەمە لەمن وەربگرە و لەبەرری بکە:

( **شەریعەتی ئیسلام هەمووی وەستاوە لەسەر ڕەحمەت** ).

بەڵگەش لەسەر ئەمە سەیرکە ئێستە :

چەند: تاوان ... دەستدرێژی ... کوشتار و ....

سوێند بە خوا جیهان پێویستی بە شەریعەتی ئیسلامی‌یە.

## لە ڕەحمەتی خوا بوونی ڕۆژی قیامەتە..

بەلاتەوە سەیرە کاتێك دەبیستی کە بوونی ڕۆژی قیامەت لە ڕەحمەتی خوایە بەرامبەرمان ؟

خوای گەورە دەفەرموێ:

## ڕەوشتی باوەڕدار

﴿كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾الانعام: ١٢

**واتە: خوای گەورە رەحم و میهرەبانی لەسەر خۆی فەرز کردوە ، سوێند بێت بەخوا بەرەو رۆژی قیامەت کە هیچ شکو گومانێکی تێدا نیە کۆتان دەکاتەوە .**

سەیری ڕیزبەندی ئایەتەکە بکە ... !! لە ڕەحمەتی خوا کۆکردنەوەی دروستکراوەکانە لەو ڕۆژەدا هەتا هەموو خاوەن مافێك مافەکەی خۆی وەرگرێتەوە..ئەو گەنجەی کە خۆی دەپارێزێ لە گوناه و چاوەکانی دەگرێتەوە لە گوناه ...هەروەها ئەوەی ستەمی لێ کراوە .... وە ئەوەی کە ستەمی لە خەڵکی کردووە..

بیهێنە پێش چاو ، کەسانێك دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا وەك گەشتیارێك کە بە دڵخۆشیەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵ ( بەڕۆژوو بووە ... نوێژی کردووە .. شەو نوێژی کردووە ... چاوی داخستووە لە ئاست حەرام... ستەمی نەکردوە ).

کەسانێکیش وەك زیندانیەکی هەڵاتوو کە دیسان دەستگیر کرابێتەوە ، دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ، ئەوانە ئەوانەن کە لە دونیادا خوایان لە یاد کردووە.

جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەم دوانە دا ... بە ڕاستی ڕۆژی دوایی ڕەحمەتە .

## لە ڕەحمەتی خوا دروست کردنی ئافرەتە..

لە شوێنەوارەکانی ڕەحمەتی خوا ئەوەیە کە ئافرەتی دروست کردووە هەتاکو سۆز لەسەر زەوی دا بڵاوبێتەوە ، خۆ ئەگەر ئەم ڕەحمەتە

نەبوایە زەوی بەتاڵ دەبوو لە سۆز و خۆشەویستی ، ئەمەش زیادەڕەوی نیە ، پێغەمبەر «ﷺ» دەفەرموێ:

« عاش آدم في الجنة قبل حواء فاستوحش ( **واتە: هەستی بە تەنهایی کرد** ) فخلقت حواء . فقال لها : من انت و لم خلقت ؟ فقالت : انا سكن لك ».

**واتە: ئادەم بەر لە حەوا لەبەهەشتا دەژیا هەستی بەتەنهایی کرد ، حەوا دروستکرا، ئادەم پێی وت : تۆ کێی و بۆچی دروستکراویت؟ ئەویش وتی تا ببمە جێی ئارامی تۆ.**

**سەیری وشەی « استوحش » بکە لەبەر ئەوە خوا حەووای دروست کرد وە سەیری پەیوەندی نێوان ژن و پیاو بکە «سكن» ئافرەت لە ئیسلامدا خوشکی پیاوانن ، لە ئیسلامدا جەنگێك نیيە لە نێوان پیاو و ئافرەت دا .. ئافرەت لە ئیسلامدا ڕێزی تایبەتی هەیە وپلەوپایەی بۆ دیاری کراوە.**

## لە ڕەحمەتی خوا دابەزاندنمانە بۆ سەر زەوی..

**لە ڕەحمەتی خوایە کە دایبەزاندوینەتە سەر زەوی ...**

**دەبینم سەرت سوڕماوە!لەپاش ئەوەی ئەمە دەخوێنیتەوە و دەڵێیت ئایا مەعقولە کە دابەزینمان بۆ سەر زەوی و نەچونە ناو بەهەشتەوە بەڕاستەوخۆیی ڕەحمەتە بۆمان !؟.**

**منیش پێت دەڵێم: زۆرێك هەن ئەم کێشەیەیان هەیە بەڵام کاتێك هۆکار زانرا سەرسوڕمان بە تاڵ دەبێتەوە !**

**سروشتی مرۆڤ وایە هەمیشە حەزی بەوشتانەیە کە بەئاسانی بە دەستی دەکەوێت و پاش کەمێکیش لێی بێزار دەبێت بەڵام ئەو شتەی**

## ڕەوشتی باوەڕدار

کە بە هەوڵ و ماندووبونێکی زۆر دەستی دەکەوێت و قەدری دەزانێت و هەرگیز لێی بێزار نابێت و زۆر لێی بەختەوەر دەبێت ، وێنەی باوك کە ماندوو دەبێت لە کۆکردنەوەی پارەدا بۆ کڕینی سەیارەیەك زۆر پارێزگاری لە سەیارەکە دەکات و ئەگەر تۆزێك بڕوشێت پێی ناخۆش دەبێت ، بەڵام دەبینی کوڕەکەی هیچ پارێزگاری لێ ناکا و بە ئارەزووی خۆی چۆنی بوێت وای لێ دەکات بۆچی ؟ لەبەر ئەوەی کە پشتی پێوە نەهێشاوە .

لەبەر ئەمە لە ڕەحمەتی خوایە ئێمەی دابەزاندوتە سەر زەوی بۆ ئەوەی تامەزرۆی بەهەشت بین .

هەموو ژیانت خوا بپەرستەو ماندوو ببە لە خواپەرستیدا هەتا بەختەوەر ببیت بە چونە ناو بەهەشت و بینینی خوا.

## ڕەحمەتیخوا سەرجەم مرۆڤایەتی گرتوتەوە بە بێ باوەڕەکانیشەوە..

هەموو ئەو ڕەحمەتانەی ڕابردوو وە هەموو ئەوانەشی کە باسیان دەکەین تەنها یەك بەشە لە سەد بەشی ڕەحمەتی خوا!!

پاکو بێ گەردی بۆ خوای گەورە و بەخشندەو میهرەبان .

لە ڕەحمەتی خوایە بەرامبەرمان کە ڕەحمەتەکەی هەموو مرۆڤایەتی گرتوتەوە بەبێ باوەڕیشەوە ... ؟

ئەمە چۆن ... ؟

ئایا خوا ڕۆژی لە بێباوەڕ گرتوتەوە ...؟ هەرگیز ... ئایا ئەمە ڕەحمەت نیە ...؟

پاكو بێگەردی بۆ خوا ! ئەوان باوەڕیان بە خوا نیە و گوێڕایەڵی ناكەن لەگەڵ ئەوەشدا ئایا هەوای لێ قەدەغە كردوون ؟ نا سوێند بە خوا .
زەوی زەوی خۆیەتی و ئاسمان ئاسمانی خۆیەتی ، لەگەڵ ئەوەشدا ڕزقیان دەدات و ئاو و هەوایان لێ قەدەغە ناكات ... ڕەحمەتێكە لە خواوە سا بەڵكو بگەڕێنەوە بۆ لای..
گوێ لەم بەسەرهاتە بگرە و بیخوێنەرەوە :
پیاوێكی بەتەمەن هاتە خزمەتی گەورەمان ئیبراهیم ، حەزرەتی ئیبراهیمیش بانگهێشتی كرد بۆ نانخواردن ، ئاگری كردەوە بۆ ئەوەی خواردنەكە لێ بنێت ، پیرە هاتە بەردەمی ئاگرەكە و كڕنوشی بۆ برد لەبەر ئەوەی ئاگرپەرست بوو ، حەزرەتی ئیبراهیم كە ئەمەی بینی بە پیرەی ووت : ئاگر دەپەرستی هەستە بڕۆ ؟ پیرەش ڕۆیشتە دەرەوە ، خوای گەورە جبریلی ناردە خوارەوە بۆ لای حەزرەتی ئیبراهیم و پێی ڕاگەیاند: ئەی ئیبراهیم تەنها بۆ كاتژمێرێك ئارامت نەگرت لەسەری لەكاتێكدا من شەست ساڵە ئارامم گرتووە لە سەری ؟.
گەورەمان ئیبراهیم شوێنی كابرای پیرەكەوت هەتا دۆزیەوەو پێی ووت : وەرە بۆ نان خواردنەكە ... پیرە ووتی بۆچی ؟ حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی : خوای گەورە ڕەخنەی لێ گرتم لەسەرت ... پیرە وتی : خوایەكی میهرەبان دەبێ بپەرسترێ . ئیتر موسوڵمان بوو .
سەیری گەورەمان ئیبراهیم بكە كاتێك دەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾ البقرة: ١٢٦

**واتە: ئیبراهیم دوعای كرد و ووتی : پەروەردگارا دەوروبەری ئەم ماڵەت بگێڕە بە شارێكی پڕ لە ئاسایش و ڕزق و ڕۆزی هەمە جۆر بەخشە بە دانیشتوانی.**

## ڕەوشتی باوەڕدار

**پاشان مەرج دادەنیٚ:**

﴿ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ ﴾ البقرة: ١٢٦

**واتە: بەوانەی باوەڕیان بە خواو ڕۆژی دوایی هیٚناوە .**

**بەلاٚم سەیری ڕەحمەتی خوا بکە:**

﴿ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ البقرة: ١٢٦

**واتە: (خوای گەورە وەلاٚمی دایەوە کە دوعات گیرایەو) فەرمووی: بەلاٚم ئەوەش کافرە بیٚبەشی ناکەم لە بەرهەم و نازونیعمەتی کەمتەمەنی ئەم دونیایە ، بەلاٚم لەوەو دوا بەناچاری تووشی سزای ئاگری دەکەم کە سەرەنجام و چارەنوسیٚکی خراپە.**

**جاریٚکی تر ئایەتەکە بخویٚنەرەوە و لیٚی تیٚ بگە..**

## ڕەحمەتە تایبەتیەکان..

**چەند ڕەحمەتیٚك هەیە تایبەتە بە باوەڕداران ، دادەبەزیٚتە سەر ئەهلی مزگەوتەکان و دەوریان دەدات وە فریشتەکانیش داوای ڕەحمەتیان بۆ دەکەن .**

**پیٚغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویٚ :**

﴿ ما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله و يتدارسونه بينهم الاّ غشيتهم الرحمة و ... ﴾ موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هیچ کۆمەڵیٚك لە لە ماڵیٚك لە ماڵەکانی خوادا کۆنابنەوە و قورئانی پیرۆز بخویٚننەوە و لیٚبکۆڵنەوە مەگەر ڕەحمەتی خوا دایان دەپۆشیٚت .**

**ئەوە ڕەحمەتیٚکی تایبەتە بە باوەڕداران:**

﴿ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴾ الأحزاب: ٤٣

واته: بەراستی ئەو پەروەدگارە هەمیشە و بەردەوام بۆ ئیمانداران میهرەبان و دلۆڤانە .

﴿ فَأَمَّا الَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِي رَحْمَتِهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْمُبِينُ ﴾ الجاثية: ٣٠

واته: جا ئەوکاتە ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە وە کاروکردەوەی چاکیان ئەنجام داوە ئەوە پەروەردگاریان دەیانخاتە ژێر سایەی رەحمەت و میهرەبانی خۆیەوە ، تەنها ئەوە سەرکەوتن و سەرفرازی ئاشکرایە .

لەبەرئەوە دەبێ هەست بکەین کە باوەڕداران لە ڕەحمەتی خوادان..

﴿ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ البقرة: ٣٨

واته: نەترسوبیمیان لەسەر دەبێت ، نە غەمگین و دڵتەنگ دەبن .

ئایا پێشتر چێژی ئەم هەستەت کردووە ؟ دە ئێستە چێژی بکە .

قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا

هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ..

کاتێک ئەم ئایەتەم دەخوێندەوە لێی تێ نەدەگەیشتم:

﴿ قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾ یونس: ٥٨ **واته: (ئەی محمد(ﷺ)) بەئیمانداران بڵێ: با دڵشاد و شادمان بن بە فەزڵ و بەخشش و رەحمەتی خوایی ، کەوابوو باهەر بەوە دڵخۆشبن ، هەرئەوەش چاکترە بۆیان لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی خەریکن کۆیدەکەنەوە و کەڵەکەی دەکەن .**

دەمووت : چۆن دڵخۆش بم بە ڕەحمەتی خوا..

بەڵام خۆشەویستان بەتەنها هەست کردن بەوەی کە ڕەحمەتی خوا دایپۆشیوین بەسە بۆ ئەوەی دڵخۆشمان کات ... بە پارە و سامان دڵخۆش مەبە بەڵکو کاتێک دڵخۆش بە هەست بکەی کە ڕەحمەتی خوا

## ڕەوشتی باوەڕدار

دایپۆشیوی .... کاتێك لە مزگەوت دا نوێژ دەکەی دڵخۆش بە ، کاتێك دوو ڕکات شەونوێژ دەکەیت دڵخۆش بە:

﴿ رحم الله رجلا قام من الليل نصلي ... ﴾. ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: ڕەحمەتی خوا لە پیاوێك کە بەشەو هەڵدەستێت و نوێژ دەکات .**

کاتێك خۆت و هاوسەرەکەت لەشەودا بەیەکەوە شەونوێژ دەکەن دڵخۆش بن ، چونکە لە ڕۆژی دواییدا لە ڕێز لێگیراوانن.

ئێستە زانیت بە چی دڵخۆش دەبیت ...!؟

ئەوەش بزانە کە تەنها زانین بەس نیە بەڵکو دەبێ بە کردەوە زانینەکان بڕازێنینەوە . وانیە !؟.

## ئەمانەوێ تێ بگەین ...!!

باشە ئەگەر خوای گەورە بەم هەموو ڕەحمەتە بەسەری کردوینەتەوە ، بۆچی لەدنیادا ئەوەندە ناسۆری دەچەژین ؟ بۆچی کێشەمان زۆرە ؟ فلان تەلاق درا .. فلان کوڕەکەی مرد .. فلان بێ کارە .. فلان لە تاقیکردنەوەکاندا دەرنەچوو .. فلان ..

گەر خوا دەیەوێ ڕەحممان پێ بکات بۆچی هەموو ئەمانەمان بەسەر دێت !؟

ئەمەش وەڵام :

هەتا وێنەکە ڕۆشن بێتەوە و تێ بگەی: ڕەحمەت دەبێ سودێك بگەێنێت یان بەر لە زیانێك بگرێت ؛ بەڵام هەندێك جار کامە سودە و کامە زیانە؟ دەگونجێ کە ئەو سودەی بەتۆ دەگات تۆ پێت خۆش نەبێت وەك ئەو منداڵەی دەرمانی تاڵ ڕەت دەکاتەوە . چونکە دەرکی

عەقڵی هێشتا کامڵ نەبووە ، نازانێ ئەو تاڵیەیەی لە دەرمانەکەدایە دەبێتە هۆکری شیفا بۆی ... بەڵام باوك بەزۆر دەیداتێ منالیش سەیری باوکی دەکات بەزمانی حاڵیش دەڵێت : بۆ ئەشکەنجەم دەدەی !؟( نمونەی بەرز و باڵا بۆ خوایە ).

کەواتە سودی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ڕەحمەتی خوات پێ بگات ئەگەر پێشت ناخۆش بێت .

سەیری گەورەمان موسا بکە ، گۆشکراوی کۆشکی فیرعەون ...لە پڕ ژیانی دەگۆڕێ بۆ ماوەی دەساڵ لە میسر ڕای کرد و لە مەدیەن دەژیا ، شوانی دەکرد.. خوایە ئەمە بۆچی لە تەلاری فیرعەونەوە بۆ شوانی ...!؟

لەبەر ئەوەی دواجار ڕێبەرایەتی نەوەی ئیسرائیل دەکات ، جا تۆ چوزانی ئەوانە کێن ؟ وە بۆ وای لێ بێت ... لەبەر ئەوەی کارەکە گەورەیە .... ئەمەش ڕەحمەت بوو بۆی .. هەندێك جار حاڵێکت بە سەردا دێت ، خوا ویستی وایە بەهۆیەوە ڕەحمەتی خۆی بڕژێنێ بەسەرتدا ، بەڵام تۆ تێی ناگەی .

## خۆشەویستم ئەی پێغەمبەری خوا تۆ

## لە گەورەترین ڕەحمەتەکانی خوایت..

**لە گەورەترین ڕەحمەتەکانی خوا ناردنی پێغەمبەرە (ﷺ)..**

**خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ الأنبياء: ١٠٧

## ڕەوشتی باوەڕدار

**واتە: (ئەی محمد(ﷺ)) ئێمە تۆمان رەوانە نەکردوە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە رەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان.**

**خوای گەورە نافەرموێ: (للمؤمنين) وە نافەرموێ:(للمسلمين) بەڵکو دەفەرموێ (للعالمين) بۆئەوەی باوەڕدار و گوناهدار و گوێ ڕایەڵ و بێ باوەڕ ، مرۆۃ و گیان لەبەر ، مرۆۃ و پەری بگرێتەوە.**

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەموێ:**

﴿ إنما بعثت رحمة ...﴾ موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: من بەڕەحمەت نێردراوم ..**

**حاڵی خۆت بهێنە پێش چاو بەبێ پێغەمبەر (ﷺ)..!!**

**بۆ ئەوەی لە مەبەستم تێ بگەی سەیری پیاوێکی گەورەی وەکو(غاندی) بکە ، ئەو عەقڵیەتێکی تایبەت بوو بەهەموو پێوەرەکان ، ئێمەش دانی پێدا دەنێین ، بەڵام سەیریکە کاتێك لە بەردەمیەوە مانگایەك دەڕۆیشت کڕنوشی بۆ دەبرد !!!**

**ئایا ڕازیت بەو جۆرە بیت ؟ ڕازیت بڵێیت من باوەڕم بە هیچ ذیە ؟!!**

**سوپاس بۆ خوا لەسەر ئەم ڕەحمەتە .**

**هاوڵاتی ئەمریکی دەستبەرداری پزیشکی دەرونی و پارێزەر نابێت ، لەگەڵ ئەوەشدا سەیری ئەو بێ سۆزی و ئەو هەموو حاڵەتی خۆکوژیەیە بکە .**

**بەڕاستی پێغەمبەری خوا لە گەورەترین ڕەحمەتەکانە ، بە هۆیەوە زانیت بۆ چی دروست کراویت ؟ وە ئامانجت چیە ؟ وە بەهۆیەوە بەهەشت و دۆزەخت ناسی .**

چەند پرسیارێکی ئاسان بەڵام ڕۆژئاوایی‌یەکان نایزانن وەڵای ئەوان بەو جۆرە ئاسان نین لەبەر ئەوەی وەڵامەکانیان بە ئاسانی دەست ناکەوێت..

کەسێکیش هەست بەم قسەیە ناکات مەگەر کەسێك لە دڵەوە پێغەمبەری خوای ﴿ﷺ﴾ خۆش بوێت وە شوێنکەوتەی بێت وە هەست بکات کە گەر پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نەبوایە ئێستا گومڕا و سەرلێشێواو دەبوین ..

وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا ڕەحمەتەکەی لە شەفاعەتی‌دا دەردەکەوێت وە ئەوە ڕەحمەتی خوایە بۆمان ، بەڵام چ ڕەحمەتێك ؟!!.

## ئێستە کاتی جێبەجێ کردنە..

ئیستەو پاش ئەوەی ڕەحمەتەکانی خوای گەورەمان زانی و شوێنەوارەکانیمان لە ژیانی ڕۆژانەماندا بینی ... کاتی جێ بەجێ کردن هاتوە ...

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:

﴿ من لا یرحم لا یرحم ﴾ بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: ئەوەی بەرەحم و بەزەیی نەبێت رەحمیشی پێ ناکرێت .**

**هەروەها دەفەرموێ:**

﴿ لا تنزع الرحمة الا من شقي ﴾ ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: ڕەحمەت تەنها لە کەسانی خراپەکار وەردەگیرێتەوە .**

لەبەر ئەوە لەپاش هەموو ئەمانە دەمانەوێ پرسیارێك بکەین:

## ڕەوشتی باوەڕدار

ئایا ئێستا هەست دەکەیت تۆ لەوانە بیت کە ڕەحم بە خەڵکی دەکەن..!؟

یان لەوانەی کە تواناى هەبوو بەسەر خەڵکیدا بوغز و ڕقی خۆیان لێ بەتاڵ دەکاتەوە ؟.

کاتێك کەسانێك دەبینیت لە حاڵەتی لاوازی دان ڕەحمیان پێ دەکەیت یان نا؟.

کاتێك شتێك لە یەکێك دەبینیت و دەتوانیت داپیۆشی ئایا دای دەپۆشی یان ئاشکرای دەکەی ؟

ئێستا وەرن با ڕەوشتی ڕەحمەت جێبەجێ بکەین و هەموو بوارەکانی ژیانمانی پێ ڕازاوە بکەین..

## یەکەم : ڕەحمەت بەرامبەر دایك و باوك..

یەکەم ڕەحمەت کە پێمان خۆشە جێبەجێی بکەین ڕەحمەتە بەرامبەر دایك و باوك..

ئەوەی کە وا لە دایك و باوکی دەکات کە بگرین بە دەستییەوە ، ئایا ئەمە ڕەحمی پێکردون ؟

ئەو کچەی دایك و باوکی دەگەیێنێتە حاڵەتێك توشی سنگ تەنگی و ئازاری دڵ دەبن ، ئایا ئەمە ڕەحمی پێ کردون ؟!

ئەوەی کە دەرناچێت وە دەزانێت کە ئەمە زۆر دایك و باوکی ئازار دەدات ، ئایا ڕەحمی پێکردون ؟

ئەو كچەی كە لەگەڵ كوڕێكدا دەڕوات ئایا دەزانێت كە ڕەحم بە دایك و باوكی ناكات ؟ دەزانیٚ كە گەر باوكی بەم كارەی بزانێت چی ڕوو دەدات!؟

ناترسی كاتێك لەماڵ دێیتە دەرەوە بە قوەت دەرگاكە بە ڕووی دایك و باوكتدا دادەخەیت ، لەو كاتەدا گەربمرن و توڕە بن لێت ... چۆن پاش ماوەی تەمەنت بەسەر دەبەیت و چ دەرەنجامێك چاوەڕێت دەكات ؟

ئەوەی كە دەچێتەماڵەوە و دەرگای ژورەكەی بە ڕووی دایك و باوكیدا دادەخات ئایا نازانێت كە بەم كارەی دەرگای ڕەحمەتی بەرامبەریان دادەخات ؟

گەورەمان ئیبراهیم ئەگەرچی باوكی بیٚ باوەڕ بوو بەڵام بە ڕەحم بوو بەرامبەری كاتێك قسەی لەگەڵدا دەكرد بە ( **یا أبت** ) دەستی پیٚ دەكرد لە گەورەمان ئیبراهیمەوە فێر ببە ...

ئاممان نەكەی بهێڵی دایك و باوكت لێت توڕە بن .

چونكە ئەمە سوێند بەخوا ئەوپەڕی وشكی و دڵ ڕەقی‌یە بەرامبەریان

ئایا ئەوەی كە مەبەستە گەیشت ؟ وا دەزانم گەیشتوە.

خۆ ئەگەر نەگەیشتوە ئەوە كێشەیەكت هەیە ... تۆ بە ڕاستی دووری لە ڕەحمەتەوە.

## دووهەم : ڕەحمەت بەرامبەر بە نزیكەكان..

جۆری دووهەم كە دەمانەوەیٚ فێری ببین وە جیٚبەجیٚی بكەین بریتی‌یە لە: ڕەحمەت بەرامبەر بە خزم و كەس و كار و نزیكان..

ڕەحمەتی تۆ بەرامبەریان ئەوەیەکە سەردانیان بکەیت ، خوای گەورە دەفەموێ :

﴿ ان الله ان الرحمن خلقت الرحم . و شققت لها اسما من اسمي. فمن وصلها وصلته و من قطعها قطعته ﴾. ئەبوداوود ریوایەتی کردوە.

**واتە: خوای گەورە فەرمویەتی: من ڕەحمانم ڕەحمم بەدیهێناوە، لەناوی خۆمم بۆ داناوە، هەرکەس بیگەیەنێت ( بەڕەحم بێت) ئەوا دەیکەیەنم(ڕەحمی پێدەکەم) هەرکەسیش بیپچڕێنێت دەیپچڕێنم .**

سەردانی کەسوکار و نزیکان ناوێکی تریشی هەیە ئەویش سیلەی ڕەحمە .

کەواتە ئایا سەردانی کەسوکار و نزیکان دەکەین تاکو بچینە ڕیزی بە ڕەحمەکانەوە ؟.

## سێهەم : ڕەحمەت بەرامبەر منداڵان..

جۆری سێهەم لە ڕەحمەتەکان ڕەحمەتە بەرامبەر منداڵان..

وەرن با فێربین چۆن بەڕەحم بین بەرامبەر منداڵان !!

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دانیشت بوو ، ئەقرەعی کوڕی حابس لەخرمەتیدا بوو حەسەنی کوڕی علی هات ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هەستاو باوەشی پیاکردو ماچی کرد ، ئەقرەع وتی : من دە منداڵم هەیە هەرگیز هیچیانم ماچ نەکردوە ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سەیری کردوو فەرموی:

﴿ من لا یرحم لا یرحم ﴾ بوخاری ریوایەتی کردوە.

کێیە دەڵێ: دینەکەمان دینێکی وشکە..؟ کێیە دەڵێ: پێویستە ڕوو گرژ بین بەرامبەر خەڵکی..؟ نا سوێند بە خوا ... سەیرکەن فێربن لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ).

ئێستا ئەی باوکی خۆشەویست شوێن پێی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵدەگری یان نا ...؟

**لەمەش زیاتر ...**

پێغەمبەر (ﷺ) دەچوە نوێژەوە و دەیویست درێژی بکاتەوە.. بەڵام کاتێك گوێی لە دەنگی گریانی منداڵ دەبوو نوێژەکەی کورت دەکردوە.

سەیری ئەو ڕەحمەتە بکە تا فێر بیت ...

وە بۆ ئەوەی هانیان بدات منداڵەکان بهێنن بۆ مزگەوت..

دەشتەکی‌یەك سەیری پێغەمبەری دەکرد (ﷺ) کاتێك منداڵەکانی ماچ دەکرد ... دەشتەکیەکە وتی : ئایا ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن !؟

پێغەمبەر (ﷺ) سەیری کردوو پێی فەرموو :

﴿ ما أملك أن نزع الله من قلبك الرحمة ﴾. ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

واتە: دەسەڵاتم چیە گەر خوای گەورە ڕەحمی لەدڵتا داماڵیبێ .

سەیرکە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئوممەتەی لە تاریکی‌یەوە برد بۆ ڕووناکی.

**گوێ بگرە بۆ ئەم بەسەرهاتە:**

منداڵێکی بچوك هەبوو لە مەدینە ناوی(عومەیر) بوو ، هەمیشە چۆلەکەیەکی پێ بوو یاری لەگەڵدا دەکرد ، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم

## ڕەوشتی باوەڕدار

چۆلەکەیەی ناو نابوو بە ( نغیر ) بۆیە هەرکات بە عومەیر دەگەیشت دەی فەرموو:( یا عمیر ما نعلَ النغیر ) ؟

ڕۆژێك لە ڕۆژان پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ عومەیری بینی دەگریا ، پێ فەرموو: ئەی عومەیر بۆچی دەگری ؟ ئەویش ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا (نغیر) مرد ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بۆ ماوەی کاتژمێرێك لەگەڵیدا دانیشت و یاری لەگەڵدا کرد ... هاوەڵان بەو جێگەیەدا تێپەڕین بینیان وا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەگەڵ عومەیردا یاری دەکات ، پێغەمبەری خواش سەیری کردن و فەرموی ( نغیر ) مردوە منیش ویستم یاری لەگەڵ عومەیردا بکەم.

بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

ئایا تۆ دەتوانی مامەڵەت بگۆڕێت بەم جۆرە لەگەڵ منالەکەت ؟

ئایا بەو ڕەحم و سۆزە مامەڵە لەگەڵ منداڵدا دەکەیت ؟

گەر منداڵت نییە کەفالەتی بێ باوکێك بکە بڕۆ جێگەیەك و دەست بهێنە بەسەر سەریدا ، چونکە دەست هێنان بەسەر سەری بێ باوکدا دڵ نەرم دەکات ...

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەموێ:

﴿ انا و کافل الیتیم فی الجنة کهاتین. فأشار بأصبعیه و شبك بینهما﴾ .

بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: من و سەرپەرشتیکاری هەتیوان وێنەی ئەم دوانەین، ئامازەی بە دوپەنجـەی کردو خستنیە تەك یەکترەوە .**

## چوارەم : ڕەحمەت بەرامبەر بە ئافرەت..

یەکێکی تر لەو ڕەحمەتانەی کە پێویستە جێبەجێی بکەین لە ژیانماندا ... ڕەحمەتە بەرامبەر ئافرەت ... پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵاندا چونە دەرەوەی مەدینەو چەند وشترێکیان پێبوو ئافرەتانیان هەڵگرتبوو . لە ناو هاوەڵەکاندا کەسێکی تیابوو ناوی ( ئەنجشە ) بوو وشترەکانی بەڕێوە دەبرد ، دەنگێکی خۆشی هەبوو ، دەستی کرد بە وتنی سرود بە دەنگێکی خۆشی نەرم ، لە خۆشی دەنگی وشترەکان دەشنانەوە و بە ملاولادا دەهاتن ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی:

**( ئەی ئەنجشە لەسەر خۆ ، ئاگات لە شوشەکان بێت ).**

بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

سەیری وەسفی پێغەمبەر (ﷺ) بکەن بۆ ئافرەتان بە شوشە ، کێ لە دوای ئەمەوە دەڵێ ئیسلام ڕێزی لە ئافرەتان نەگرتوە..؟ پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك خاتور فاتیمەی کچی دەبینی هەڵدەستا و ناوچاوی ماچ دەکرد.

لە ڕەحمەتمان بەرامبەر بە ئافرەت ئەوەیە کە بە گرژی مامەڵەیان لە گەڵدا نەکەین ، بەڵکو مامەڵەیەکی جوانمان هەبێت و لێوان لێوی ڕەحمەت بێت پێغەمبەر (ﷺ) بە هیچ جۆرێك نە لە ئافرەتێکی داوە و نەسوکایەتی پێ کردوە.

ئامان نەکەی لەسەر بناغەی بێ ڕەحمی مامەڵە لەگەڵ خوشکت یان دایکت یان کچەکەت یان هاوسەرەکەت بکەی ... هەر کەس وا مامەڵە دەکات با هەر ئێستا مامەڵەکەی بگۆڕێ و شوێن پێی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵگریت .

## ڕەوشتی باوەڕدار

کۆتا ووشەی پێغەمبەر (ﷺ) پێش وەفاتی بریتی بوو لە وەسیەتێك بۆ پیاوان کە لەگەڵ ئافرەتاندا باش بن :

﴿ اوصيكم بالنساء خيراً ﴾.

ئامۆژگاری‌یەکیشم هەیە بۆ لاوان:

ڕەحمەتی تۆ بەرامبەر ئافرەت ئەوەیە کە هاوڕێیەتی کچێك مەکە ، چونکە زۆربەی کات تۆ ئەو کچە ناکەیتە هاوسەری خۆت لەبەر ئەوە حەرامە ئەو دڵە شوشەیە بشکێنیت ... حەرامە سەرقاڵی بکەی بە خۆتەوە لە کاتێکدا ئەو هاوسەری کەسێکی ترە ، حەرامە وای لێ بکەیت بەراورد بکات لە نێوان تۆ و مێردەکەی‌دا ، حەرامە بەڵێنی هاوسەرداری پێ بدەیت و وەفات نەبێ بەرامبەر بەڵێنەکەت ... ئەمە لە گەورەترین ئەو شتانەیە کە وەلانانی ڕەحمەتی تیایە بەرامبەر ئافرەت .

هەروەها ئامۆژگاریم بۆ باوکان :

لە کچەکەت مەدە ... هەست و شعوریان بریندار مەکە ... بەڕەحمەت مامەڵەیان لەگەڵدا بکە ...

ئەمەش مانای ئەوە نی‌یە ئێمە پەروەردە واز لێ بێنین . تکایە ڕوکای قسەکان وەرمەگرە ، بڵێیت من بە ڕەحمم و لە منداڵەکانم نادەم !! چونکە ئێمە لە سەرەتاوە ئاماژەمان بەوە کرد کە هەندێ جار ڕێگە لە کارێك دەگرین کە کەسێك دەیەوێ بیکات وەك ڕەحمێك بەرامبەری تاك و نەکەوێتە هەڵەوە ... وانییە ؟!

هەروەها ئامۆژگاریم بۆ مامۆستایان..

وە هەروەها ئامۆژگاریم بۆ ئەو مامۆستایانەی لە هۆڵی تاقیکردنەوەکاندا چاودێرن نەکەی بڵێیت واز لە منداڵەکان دەهێنم با

ساختەکاری بکەن گوناحن با ڕەحمیان پێ بکەم با دوا نەکەون .. ئەم ڕەحمەتە لە جێگەی خۆیدا نیە .. ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵەیە !!.

## پێنجەم : ڕەحمەت بەرامبەر بە گیانلەبەران..

هەروەها لە جۆرەکانی ڕەحمەت ... ڕەحمەتە بەرامبەر گیانلەبەران..
پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەموێ:
﴿ بينما رجل يمشي اشتد عليه العطش . فنزل بئراً فشرب منه ثم خرج ، فأذا هو بكلب يلهث يأكل الثرى من العطش ، فقال الرجل : قد بلغ هذا مثل الذي بلغ مني . فنزل فملأ خفه ثم صعد فسقى الكلب فشكر الله له فغفرله ﴾. بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

واتە: لەکاتێکدا پیاوێك دەڕۆیشت تینوێتی زۆری بۆهێنا، چوە ناو بیرێکەوە ئاوی لێخواردەوە دواتر هاتەدەر ، دیتی سەگێك دەوەڕێ وزمان بەزویدا دێنێت لەتاو تینوێتی ، کابرا وتی: ئەمە بارەکەی منی بەسەردا هاتوە، ئەوجا چوە خوارەوە بۆناو بیرەکەو پێڵاوەکەی پڕ لەئاوکردو هاتەسەرەوەو سەگەکەی تێراوکرد خوای گەورەش پاداشتی دایەوەو لەگوناهەکانی خۆشبوو .

ئایا پێشتر کاری وات کردوە ؟ ... سەگێك ببینیت لەسەر جادە و خواردنێکت بۆ هێنابێت بیخوا ، یان ئاوت بۆ هێناوە ... سوێند بە خوا ئەوە ڕەحمەتە بەرامبەر بە گیانلەبەران .

وە هەمومان چیرۆکی ئەو ئافرەتە دەزانین کە چوە ئاگرەوە لەبەر پشیلەیەك کە بەندی کردبوو نەخۆی خۆراکی دەدایەو نە ڕێگەشی دەدا خۆی بچێت بۆ خۆی خۆراك پەیدا بکات.

پاکو بێ گەردی بۆ خوا !! چۆن شانازی ناکەین بە دینەکەمانەوە ؟ چۆن شانازی ناکەین بەوەی کەوا مسوڵمانین..؟ دینێك پارێزگاری لە

گیانداران بکات و ڕەحمیان پێ بکات ... ئەی دەبێ حاڵی لەگەڵ مرۆڤەکان چۆن بێت ؟!!.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

﴿ من ذبح عصفوراً او قتله في غير شيء، ساله الله عنه يوم القيامة ﴾.

ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هەرکەسێك چۆلەکەیەك سەربڕێت یان بیکوژێت بێ ئەوەی سودی لێوەرگرێت ، ئەوا خوای گەورە لەقیامەتدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات !!**

عبداللەی کوڕی عومەر بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشت ، کۆمەڵێك گەنجی بینی مریشکێکیان بەستبوەوە و بەردیان تێ دەگرت ... پێی وورتن : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعنەتی کردوە لەوەی کەوا ئەو کارە دەکات .

باسەکە لێرەدا باسی سەگێك و پشیلەیەك و مریشکێك نیە ... بەڵکو باسەکە ئەوەیە کە دڵ ڕەحمەتی لێ داڕنراوە .

## شەشەم : ڕەحمەت بەرامبەر تاوان باران..

ئەمەش ڕەحمەتێکی تری سەرسوڕهێنەرە کە ڕەحمەتە بەرامبەر تاوانباران و گوناهکاران ... خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ ﴿ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ ﴾ النساء: ٩٤.

**واتە: خۆ کاتی خۆی ئێوەش وابوون ،تا خوا منەتی نایە سەرتان .**

ئامان نەکەی ڕابردوی خۆتت لەیاد بچێتەوە بیرت چوو پێشتر چی بویت ؟ ئێستا گاڵتە بەخەڵکی دەکەیت لەبەر گوناهەکانیان و خۆتت لە بیر چۆتەوە..؟ لەبەر ئەوە ئامۆژگاریم بۆت ئەوەیە کە وەك سەرەتا مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بکە نەك وەکو ئێستا ، لەگەڵ گوناهباراندا بە

نەرمی و ڕەحمەت مامەڵە بکە ، نەکەی نزایان لێ بکەیت ، بەڵکو نزایان بۆ بکە بە هیدایەت هەر وەك چۆن خوا هیدایەتی تۆی دا ..

فێر ببە لە ڕەحمەتی باوەڕدارەکەی سورەتی ( یس ) بەرامبەر قەومەکەی کە زۆر بانگی کردن بۆ ڕێی ڕاست و خواپەرستی بەڵام ئەوان گوێیان بۆ نەگرت و کوشتیان:

﴿ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَ ﴾يس: ٢٦ **واتە: پێی ووتراوە : فەرموو بۆ ناو بەهەشت .**

**یەکەم ووشە کە ووتی:**

﴿ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴾ يس: ٢٦.

**واتە: لەوێشەوە هەر دڵسۆزانە وتویەتی : خۆزگە قەومەکەم بیانزانیایە ..**

**پاکو بێ گەردی بۆ خوا ئەمە چ ڕەحمەتێکە ...**

**لێوەی فێر ببە و بزانە کە خەڵك لە ناوەخنیدا خێر هەیە سەرەڕای تاوان و گوناهیان با دروشمت ئەمە بێ:**

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾النحل: ١٢٥

**واتە: (ئەی پێغەمبەر(ﷺ)ئەی ئیماندار) بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامە و ڕێبازی پەروەردگارت بەحیکمەت و دانایی و ئامۆژگاری بەجێ .**

**نەکەی بڵێی:هیچ ئومێدێکم پێیان نیە ، لە یادت بێ هاوەڵان دەیان فەرموو: ئەگەر گوێدرێژەکەی خەتتاب باوەڕ بهێنێ عومەر باوەڕ ناهێنێ!!.**

## حەوتەم :ڕەحمەت بەرامبەر هەموو خەڵکی بە گشتی..

**دڵتم بۆ بکەرەوە..**

## ڕەوشتی باوەڕدار

کۆتا جۆر لە جۆرەکانی ڕەحمەت کە دەمانەوێ جێبەجێی بکەین ڕەحمەتە بەرامبەر هەموو خەڵکی ..

ئەمە چۆن ؟

تۆ تەنها دڵت بکەرەوە بۆم ... بەنەرمی مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بکە .. هەوڵ بدە ، هەلەکان لەدەست نەدەی .

لەگەڵ هەژارێکدا بەسۆز بە لەوە ببورە کە ستەمی لێ کردویت ، پێبکەنە بەدەم منالێکی هەژارەوە ... سوێند بەخوا شت زۆرە کە بتوانی بە هۆیەوە بەڕەحم بیت لەگەڵ خەڵکیدا ، ئەمەش لە نیشانەکانی بەڕەحمی دڵە ... ئایا ڕۆژێك تاقیت نەکردوٚتەوە بڕێك پارە بدەیت بە هەژارێك ، ئایا تاقیت نەکردوٚتەوە کە ڕۆژێك خواردنی خۆش دەخۆیت و بەشێك لە خواردنەکەت بردبێت بۆهەژارێك..

لە ڕەحمەتی تۆ بەرامبەر بەخەڵکی ئەوەیە کە بۆ ئەو هەلانە بگەڕێیت.. مرۆڤێك پێویستی بەتۆیە کە بڕێك پارەی بدەیتێ ڕەحمەتە ئەگەر بیدەیتێ تا لەو ناڕەحەتیەیە ڕزگاری بێت..

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

﴿ من فرج عن مؤمن كربة من كرب الدنيا فرج الله بها عنه كربة من كرب يوم القيامة ﴾.

بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هەرکەسێك نیکەرانیەك لەدنیادا لەسەر باوەڕدارێك لابەرێت ، ئەوا خوای گەورە لەنیکەرانیەکانی قیامەتی لەسەر لادەبات .**

دەی..... ڕەحم بە خەڵکی بکە ....

لە ڕەحمەتت بەرامبەر بە خەڵکی ئەوەیە کە هەڵەکانیان داپۆشین و ئاشکرای نەکەین .

ئاممان نەکەیت خاڵی لاوازی هاوڕێکەت بزانیت و بەهۆیەوە زەلیلی بکەیت ، چونکە ئەوە لە نیشانەکانی دڵ ڕەقیە ..

ئەبوزەڕ دەفەرموێ :پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی پێ کردوم کە بە ڕەحم بم لە بەرامبەر هەژاران و لەگەڵیاندا دانیشم .

لە ڕەحمەتمان بەرامبەر خەڵکی ئەوەیە کە سزایان نەدەین ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:

﴿ أشد الناس عذابا يوم القيامة أشدهم عذابا بالناس في الدنيا ﴾.

**واتە: کەسێك سەخترین سزادەدرێت لە قیامەتدا کەلەدنیادا زۆرسزای خەڵکی دابێت .**

لە ڕەحمەتمان بەرامبەر بە خەڵکی ، ڕەحمەتە بەرامبەر بە تەمەنەکانمان ، نەکەی ئەی لاو لە هۆکارێکی گواستنەوەدا بیت و بە تەمەنێك بێت تۆش هەڵنەستی لەبەری ، چونکە ئەوە بێ ڕەحمیە ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ:

﴿ ما أكرم شاب شيخا لسنه إلا قيض الله له من يكرمه عند سنه ﴾.

ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: هەر لاوێك ڕێز لەپیرێك بگرێت لەبەر تەمەنەکەی، ئەوا خوای گەورە لەکاتی پیربونیدا کەسێکی بۆ دەسازێنێت لەبەر تەمەنەکەی ڕێزی لێبگرێت .( واتە تەنها لەبەر پیریەکەی نەك لەبەر تەماعێکی دنیایی )**

بەم شێوەیە زانیت کە دەبێ ڕەحممان هەبێت بەرامبەر بە دایك و باوك و نزیکان و منداڵان ، ئافرەتان و خزمەتکار ، گیانداران و گوناهباران ، موسوڵمانان و خەڵکی بە گشتی ...

ئایا لەپاش ئەوەی ڕەحم بە خەڵکی دەکەیت ، خۆت لە یادت دەچێت ؟

## ڕەوشتی باوەڕدار

ئەی چۆن ڕەحم بە خۆت دەکەیت ؟
بەوەی کە گوێڕایەڵی خوا بیت ..
ئێستە لە خۆت بپرسە :
چەند لە ( دە ) وەر دەگریت ؟ یەك ، یان دوو ، یان پێنج ، یان نۆ ...؟
دەترسم ڕەحمەتت هەبێت بەرامبەر هەموو کەس و حەقی هەموان بدەیت ؛ بەڵام کەمتەرخەم بی لە ڕەحمەتت بەرامبەر بە دایك و باوکت ، ئەو کاتە کێشەیەکی گەورە ڕو دەدات ..
دە تکایە لە دایك و باوکتەوە دەست پێ بکە و لەیادت بن..

## لێت پیرۆز بێت دڵی نەرم و فرمێسکی چاو ..

تۆ ئەگەر هەموو ئەم ڕەحمەتانە جێبەجێ بکەیت بە کارامەیی شتێکی سەیر دەبینی ئەویش :
فرمێسکی چاوت زۆر نزیك دەبێت ، دڵت زۆر نەرم و حەساس دەبێت ، پاکو بێ گەردی بۆ خوا ... پەیوەندیەکی نادیار و پتەو هەیە لە نێوان دەست هێنان بە سەری منداڵێکی بێ باوکدا و پاڕانەوە بۆ لاواز و ژێر دەستەکان و ڕەحمەت بە هەژاران لێقەوماوان ، و ڕەحمەت بەرامبەر بە گیانداران لەگەڵ دڵی نەرمدا .
پیرۆزە لێت ئەی ئەو کەسەی کە ئێستە نیەتت هێناوە ڕەوشتی ڕەحمەت جێبەجێ بکەیت ... پیرۆزە لێت دڵ نەرمی و فرمێسکی چاو دڵنیابە بە پشتیوانی خوا گوناهەکان دەشواتەوە.

## وننزل من القران ما هو شفاء و رحمة..

**ئەوەی سەیری حاڵی ئەمڕۆی جیهان بکات شتێك دەبینێت لەوپەڕی خەتارناکیدا .**

**ئەویش ئەوەیە کە هەتا زانستی سەردەم پێش بکەوێت ، ڕەحم لە جیهاندا کەم دەبێتەوە . دەبینی چەکی ئەتۆمی بە مەلایین دەکوژێ ، چەکی جرسومی و عنقودی ... بەڵام بۆچی ڕەحمەت کەم دەبێتەوە بە زیادبونی زانست ؟**

**لەبەر ئەوەی زانستی بێ ڕەحمەت موصیبەتە . لەبەرئەوە سەیری قورئان بکە ، ... بەڕاستی شیفا و ڕەحمەتە ... ناگونجێت لە قورئاندا وتەیەك سەبارەت بە زانست هاتبێت مەگەر باسی ڕەحمەتی لەگەڵدا کراوە ...**

**پاکو بێ گەردی بۆ خوا ... خوای گەورە دەفەرموێ :**

﴿ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا ﴾ غافر: ٧ **واتە: پەروەردگارا: رەحمەت و میهرەبانی تۆ ، زانست و زانیاری تۆ هەموو شتێکی گرتۆتەوە.**

**هەروەها دەفەموێ :**

﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾ الكهف: ٦٥.

**واتە: لەوێ بەبەندەیەك لە بەندەکانی ئێمە ئاشنا بوو کە لەرەحمەتی تایبەتی خۆمان بەهرەوەرمان کردبوو زانست و زانیاری تایبەتی خۆمانمان پێ بخشیبوو .**

**دەتبینم دەڵێیت : ئەمە یەکەم جارە هەست بەوە دەکەم ، بەڵام گەر ئێمە قورئان بە تێگەیشتنەوە بخوێنینەوە دەبینین نهێنیەکانی ئەم قورئانە دەچێتە دڵ و دەرون و ژیریمانەوە بە ڕاستی قورئان شیفایە بۆمان ...**

**ڕەوشتی باوەڕدار**

**زانستێك کە ڕەحمەتی لەگەڵدایە چاوەڕێی چێژێکی زۆری لێ بکە چاوەڕێی پێشکەوتن و ئارامی و دامەزراوی لێ بکە بەڵام زانستی بێ ڕەحمەت چاوەڕێی**

## یاالله ... تەنانەت ئیبلیسیش..

**پێغەمبەر «ﷺ» دەفەموێ:**

« ان الله خلق الرحمة يوم خلقها مائة رحمة امسك عنده تسعة و تسعين رحمة وارسل في خلقه رحمة واحده تتراحم بها الخلائق الى يوم قيامة . فأذا جاء يوم القيامة ضم الله هذه الرحمة الى تسعة وتسعين . ثم نشرها و بسطها على كل خلقه كل رحمة منهم كما بين السماء والأرض . فلا يهلك يومها الى هالك ». ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: خوای گەورە ئەوڕۆژەی ڕەحمی دروستکرد کردی بە سەد بەش، نەوەدونۆی لای خۆی هێشتەوە، یەك ڕەحمیشی بۆ دروستکراوەکانی خۆی نارد، تارۆژی قیامەت بەو ڕەحمەوە لەگەڵ یەکدا بەسۆزدەبن، کاتێك قیامەت هات خوای گەورە ئەم ڕەحمەش دەخاتەوە لای نەدونۆ ڕەحمەکەی ترو دواتریش پەخشی دەکاتەوە بەسەر دروستکراوەکانیدا ، هەر ڕحمەتێکی ئەندازەی نێوان ئاسمانو زەویە، ئەوڕۆژە مەگەر تەنها فەوتاوەکان تیا بچن!!.**

**پێغەمبەر «ﷺ» دایکێکی بینی دەستی مناڵەکەی گرتبوو فەرموی**

« اترون هذه المرأة طارحة ولدها في النار ؟ فقالوا لا قال فالله ارحم بعباده من هذه بولدها » بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

**واتە: ئایا دەبینن(پێتانوایە) ئەو ئافرەتە مندالەکەی بخاتە ناو ئەو ئاگرەوە ؟ وتیان نەخێر. فەرموی : دەی خوای گەورە زۆر بەڕەحمترە بەرامبەر بەندەکانی زیاتر لەڕەحمی ئەو دایکە بەرامبەر منداڵەکەی .**

تەنانەت زانایان دەفەرمون : تەنانەت ئیبلیسیش دەگەڕێت بە دوای ئەو ڕەحمەتەدا تاکو بیگرێتەوە ، بەڵام ئەو لە کوێ و ڕەحمەتی خوا لە کوێ؟ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ڕەحمەتی خوا ئەوەندە فراوانە ، ئیبلیسیش وای بۆ دەچێ کە بێبەش نەبێ لێی ..

گەورەمان علی کوڕی ابو تالب دەفەموێ :

( گەر لە ڕۆژی دوایدا پێم بڵێن لێپرسینەوەت دەدەینە دەستی دایك و باوکت ڕازی نابم ، چونکە خوا زۆر لە ئەوانیش بە ڕەحمترە .)!

بە ڕاستی... ( ڕەحم بکەن بەوەی لەسەر زەویە ، ئەوەی لە ئاسمانە ڕەحمنتان پێ دەکات ) بە ڕاستی وایە ...

ڕۆژی قیامەت ڕۆژێکە لە هەموو کات زیاتر پێویستیمان بە ڕەحمەتی خوا هەیە ... دەبا لە ئێستاوە لە هەوڵی دەستخستنی ئەو ڕەحمەتە دابین با خۆشەویستی بچێنین تا خۆشەویستی بدورینەوە .

﴿ انت رحمتي ارحم بك من اشاء من عبادي ﴾

واتە: تۆ ڕەحمەتی منی هەریەکێکم بوێت لەبەندەکانم بەتۆ ڕەحمیان پێدەکەم ..

کۆتا ڕەحمەتی ڕۆژی قیامەت ... ئەو ڕۆژەیە کە ئەهلی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە و ئەهلی دۆزەخیش دەچنە دۆزەخەوە ، بەڵام کۆمەڵێك مسوڵمانی گوناهکار هەن کە هێشتا لە دۆزەخ ڕزگاریان نەبووە و پاك نەبونەتەوە ، پێغەمبەر (ﷺ)دەوەستێت و شەفاعەتیان بۆ دەکات و بانگ دەکات :

خوایە تاوانبارانی ئومەتەکەم ، تاوانبارانی ئومەتەکەم..

خوای گەورەش دەفەرموێ :

بڕۆ ئەی محمد لە ئاگر دەریان بێنە ،

## ڕەوشتی باوەڕدار

پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشت و دەری هێنان و خستنیە بەهەشتەوە ، پاشان جارێکی تر گەڕایەوە و هێشتا مسوڵمانانی گوناهبار ماون لە دۆزەخدا ، دیسان ئەوەی پێش و ڕووی دایەوە ، بۆ جاری سێیەم ، پاشان بۆ جاری چوارەم ، بەو جۆرە پاشان فریشتەکان شەفاعەتیان کرد ، پاشان ئیمانداران ، بەڵام هێشتا هەندێك ماونەتەوە لە دۆزەخدا ، خوای گەورە دەفەرموێ :

پێغەمبەرانم شەفاعەتیان کرد ، فریشتەکان شەفاعەتیان کرد ، ئیماندارانیش بە هەمان شێوە ، محمدی خۆشەویستیشم شەفاعەتی کرد ، ئایا من لێبوردە نەبم ، ئیتر خوای گەورە ڕەحمەتی خستە کار و دەستی خستە ناو دۆزەخ و ئەوەی کە بە قەدەر مسقاڵە زەڕەیەك:

( لا اله الا الله محمد رسول الله ) لەدڵیدا بوبێت هێنایە دەرەوە ، هەمویان سوتابوون ، خوای گەورە خستنیە ناو ڕوبارێکەوە پێی دەوترێ ڕوباری ژیان ، هەروەك ئەوەی دانەوێڵەیەك بچێنی گەش و زیند و دەبنەوە هەر وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

( اخر الرحمات وخول الجنة ) بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

واتە: کۆتا ڕەحمەتەکان چونە بەهەشتە .

خوای گەورە بە بەهەشت دەفەرموێ :

( انت رحمتي ارحم بك من اشاء من عبادي ) .

واتە: تۆ ڕەحمەتی منی ڕەحمت پێ دەکەم بەهەرکەسێك کە بمەوێ لە بەندەکانم.

ئێستا زانیتان بۆ چی خوای گەورە نەوەد و نۆ بەشی ڕەحمەتی لای خۆی بەجێ هێشتۆتەوە ؟

لەبەر ئەوەی دونیا تەنها شایەنی یەك ڕەحمەتە . بەڵام بەهەشت شایەنی هەر سەد بەشەكەیە..

خوا ڕەحمەت بخیتە دڵ و دەرونمانەوە و وامان لێ بكەیت ببێتە سیفەتی هەمیشەییمان.



## ڕەوشتی باوەڕدار

| پێرست | لاپەرە |
|---|---|